گومان لەوەدا نییە کە سەرەمەدی زۆر لە یاساو ڕێساو ئاداب و دەستوور، کۆمەڵەو کۆمەڵ دایناون. تەنانەت فرە لە یاساو ڕێسا کۆنەکان کە یادگاری سەروبەندی نەزانیی مرۆن، دەشێ بە یاساو ڕێسای کۆمەڵەکی نێو ببرێن و دەکرێ ئەمانە لەناو ئایین و بیروباوەڕی نەتەوە شارستانییەکانیشدا دەستنیشان بکرێن. وەلێ ئایین ئەمانە بە سەرەتاو سەرەمەدی ئایین لە قەڵەم بدرێن. بگرە لەناو خەڵکی نەزان و لە هەموو شارستانییەتێکەوە بە دووریشدا هێزێ هەیە کە زۆر لە هێزو دەسەڵاتی هۆز و عەشیرەت بڵیندترو بەرێزترەو لە پشت پەردەی ئەو بیروباوەڕانەوە هێزێکی نهێنیی وا هەیە (ماتریالیستەکان بڕوایان بە هیچ هێزێکی پشت پەردە نییە) کە ئەسڵەن بە هێزی دەوروبەر و دەسەڵات لە قەڵەم نادرێ، بێ گومان جاری واش هەبووە هێزێکی لە خەڵکی بەدەر یا شەخسیش لە ئاییندا پەیدا بووە.. هێندێ جار وا ڕێک کەوتووە لەناو جەرگەی نەتەوەیەکەوە تاکە کەسێ سەر هەڵ دەداو یاساو ڕێساو ڕێورەسم و بیروباوەڕی ئایینی ئەو نەتەوەیەی کە چەندین چەرخ و چاخ کۆنێ لە مستی بوون، ژێروژوور کردووەو شۆڕشێکی گەورەی لە دنیای بیروباوەڕی مرۆڤدا هێناوەتە گۆڕێ. ئەگەر ئایین لە تایبەتیی تەنیا هۆزێ یا کۆمەڵێکی تایبەت سەری هەڵ دابا، ئەم هەموو پێشکەوتنانە هەرگیز ڕوویان نەدەدا، چونکە هێزی تاکە کەس و شەخسیی ئایین لە هێزی کۆمەڵەکیی وی کەمتر نییە. لە ئاییندا بڕوا بە هێزێکی دەرەکی هەیە.. لەم حاڵەتەدا دەبێ هێزێکی دەروونیشی تێدا هەبێ، کە باس لە چۆن پەیدابوون و سەرەتای وی دەکا... ئایین لە بنەچەدا، لە کۆمەڵ لە دایک نابێ، بە ڕواڵەت لەوی وەرگیراوە، بەڵام گەوهەرەکەی مەعنەوی و شەخسییە. بەڵێ ئەمەیە بیروبۆچوونی کۆمەڵگەری لەمەڕ پەیدابوونی ئایین. دیارە ئەمە لە دوو نیگاوە لێک دەدرێتەوە: یەکەمیان نیگای ماددەگەرییە، کە ئایین بە ڕەنگدانەوەیەکی خەیاڵییانەی واقیعی ماددی لە مێشکی مرۆڤدا، لە قەڵەم دەداو پێی وایە هیچ ئەسڵ و بنەمایەکی نییەو مرۆ بۆ خۆی دروستی کردووەو هەر بۆ خۆشی لە بەریەکی هەڵدەوەشێنێ و بەپێی گەشەکردنی خەیاڵ و مێشکی، گەشەو پەرەی پێ دەدا.. دووەمیان نیگای نموونەگەری (ئایدیالیزم)ە. بە باوەڕی ماددەگەری، مرۆ لە سەرەتای پەیدابوونیدا مێشکی توانستی وێنەی چتی بەرچاو عەمارکردنی نەبووە، چتی تەنیا بەرچاوەکیی ڕاستەوخۆی دەرک کردووە، کە چتەکەی لەپێش چاو نەماوە هێشتا بەهرەی ئەوەی نەبووە وێنەی چتەکە بەبێ دیتنی بە بیردا بێتەوە. دە قۆناغی چت بەرجەستە کردندا ژیاوە، بەڵام وردە وردە پێش کەوتووەو مێشکی پتری پەرەساندووەو عەمارکەرو وەبیرهێنەوەو خەیاڵی لە مێشکدا بۆ پەیدا بوون. لە سای ئەمانەوە توانیویە، ئیدی وێنەی چت لە مێشکیدا عەمارکا، ئەگەر پێویستی پێ بووبێ

جارێکی دیکەی وەپێشە چاوی خۆ هێناوەتەوە.. ئەمە تەنێ بەش بە حاڵی هەستی بینین. بەش بە حاڵی هەستی تام کردن و بۆن کردن و دەست لێدان (لمس) و هەستی بیستن، ئەمانەش وردە وردە وەگەشە کەوتوون.. هەروەک توانیویە چێتی بەرچاو وەبیرە خۆ بێنێتەوە، هەر وەو تەرحەش توانیویەسی بۆن و بەرامەی گوڵێ، تامی چێتێکی شیرین، یا ترش، دەنگێکی خۆش یا ناخۆش، چێتێکی گەرم یا ساردیش وەبیرە خۆ بێنێتەوە.. زانست چەسپاندوویە کە مرۆ، با لە خەیاڵ کردنەوەدا زۆر دواکەوتەش بێ، بەڵام بۆ ناسینەوەی چت پەنا وەبەر وێکچواندن و بەراوردکێ دەبا، مەجازو ئیستیعارەو کینایەت (میتافۆرە) لەمەرا پەیدابوون. لەبیرم دێ لە ساڵی (١٩٣٥)، تەمەنم هەر پێنج ساڵ دەبوو، گوتیان ئەسپەچۆێنە پەیدا بووە.. ئەسپەچۆێنە چییە؟ پایسکل.. ئەتۆ بنۆرە مرۆ کوو بە بەهرەی خەیاڵ ئالیپاتەکانی (مەجازی تشبیه، ئیستیعارە، کینایە، مەجازی ئەقڵی، چێتێکی کە پێشینەی لە کنی ئەبووبێ بۆ خۆی دروستی دەکا.. بڕوا بفەرموون هەر ئەو یارلو توانستی خەیاڵ و وەبیرهێنانەوەیەیە، کە مرۆ لە سەرەتادا لە هەموو سەروبەندێکی ژیانیدا چەندین خوداو بت و ئایین و تاد...ی بۆ خۆی بە خەیاڵ دروست کردوون. ئەوجا بەم قۆناغەی پاش واقیع بەرجەستەکردنە کە باسم کرد، قۆناغی مانا (هێزی پێولر) دروست کردن، چێتی نابەرچاو لە مێشکدا تەسەوور کردنی (ئەبستراکت = تجرید) پێ دەگوترێ.

ئەمن پێم وایە ئەم بیروبۆچوونانە، بەتایبەت ئەوانەی لەسەر بنچی خەیاڵ رۆنراون، خۆیان لەبەر رەخنەی زانستانە راناگرن. هیچ گومان لەوەدا نییە کە مرۆ، لەپێشدا بە چێتی بەرچاو (بەرهەست) قەناعەت دەکا.. ئەوە مەشهوورە، کە دەڵێن، مەلایەک سەرمەشقی بۆ شاگردێک دادەدا، ناوی ماری بۆ نووسی. ئەخوێندوارێک حازری مەجلیس دەبێ، دەڵێ: مامۆستا چ رەوای هەقە تۆ ئەو منداڵە چەواشە دەکەی، تو خودا مار ئەوەیە کە تۆ بۆ ئەو منداڵەت نووسیوە - کوێرێک دەکێشی وەک وێنەی مار- دەڵێ تو خودا ئەمە مارە یا ئەوەی تۆ؟!

بەش بەحاڵی نموونەگەری، ئایین لە پێشکەوتووترین شێوەیدا، چێتێکە لەلایەن خوداوە بەهۆی پێغەمبەرانەوە بۆ مرۆ دێتە خوارێ و مرۆ هەر ئەوەندەی لەسەرە تێی بگاو کاری پێ بکاو ژیانی ئەم دنیای خۆی پێ رێک بخاو بۆ ئەو دنیاش بەپێی فەرمایشتەکانی خوداوەند رەفتار بکا؛ بۆ ئەوەی ئەو دنیاشی بە قسمەت بێ. ئایین لە نموونەترین شێوەیدا کە لە ئیسلامەتیدا بەرجەستە بووە لە گەوهەردا هاوسەنگییەکی رەوانی و تا رادەیەک ئابووریی بۆ موسڵمانان بڕیار داوە. لەم وتەیەدا کە دەڵێ: (اعمل لدنیاک وکانک تعیش أبدا واعمل لاخرتک وکانک تموت غدا) ئەم تەوازون و

هاوكێشەیە بە ڕوونی بەرچاو دەكەوێ.

بەڵام دەبێ ئەوەش بزانین كە ئەم بیروبۆچوونانە هەموو دەمەتەقێ و بگرەو بەردە هەڵ دەگرن و هەر یەكەیان شایانی بەرپەرچ دانەوەی خۆیەتی.. جارێ یەكەم جار: ئەم ئاینانە هەر وا لە سەرەتاوە بەم ڕێكوپێكییە نەهاتوونە گۆڕێ، بەڵكو پاش چەندین دەورو زەمان گۆڕان و مشت و ماڵ كران ئەوجا بەو شێوەیەی ئەوڕۆ گەیشتوون... ئەوەتا خوداوەند لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: «الیوم أكملت لكم دینكم وأتممت علیكم نعمتي» سوورەتی المائدة ئایەتی ٥). لەوەرا بەدیار دەكەوێ، كە ئاینەكان هەروا لە خۆڕا كوردواتەنی «لە پڕێ نەبوون بە كوڕێ»، بەڵكو بەرە- بەرە تەكامولیان كردووە. ڕاستە مرۆ لە سەرەتای پەیدابوونیدا لە هەموو چتێ سڵەمیوەتەوەو ترساوە، بەڵام پاش ئەوەی وردە - وردە مێشكی وە گەشە دەكەوێ، ترسی لە چتان دەڕەوێتەوەو بگرە بەسەر زۆر چتدا زاڵ دەبێ.. ئیدی ناترسێ، بەڵام ئاینی دەگەڵدا هەر دەمێنێ. مرۆ پاش ئەوەی لە گرفتاری چتی ماددیی خۆڕزگار دەكا - خولیای خۆ دەبوێرێ، لە بیركردنەوە ناوەستێ، ئەوە سروشتی مرۆیە، هەر بیر دەكاتەوەو بیر دەكاتەوە... ئەگەر وا نەبا ئیفلاتوونێك، ئەرستۆیەك، ئەم هەموو فەیلەسووفانە پەیدا نەدەبوون. چتێكی دیكەش: ڕاستە مرۆ هەنگاوی زۆتری هەڵێناوەو بەو هەندە قایل نەبووە، وەلێ لەمەش بەولاترەوە هەنگاوی هەڵێناوە، بە تەنێ دەرك كردنی ڕاستی و جوانی، دڵی دانەكەوتووە، بەڵام ئەمانە چتهایەكی ڕووت (مجرد = ئەبستراكت)ن و قەناعەت بە مرۆ ناكەن.. مرۆ خاوەنی كەسایەتییەو هەر كەسایەتیشە كە بایەخ و بەها بەم بیروبڕوایانە دەدا. بە بایەخترین و ڕێزدارترین و بەنرخترین چت كە مرۆ هەیەتی كەسایەتییە، نەك بیروباوەڕ.. ئەدی ئەوە نییە كاتێ مرۆ چەند هەنگاوێكی دیكە هەوراز تر چووە، خودلوەندی بە شێوەیەكی شەخسی وێنە كێشاوەو بۆی ڕوون بووەتەوە كە خودا نە هێزێكی سەحراوییەو نە چتێكی وەك چیای بڵیند و دەریای بێ پایانە و نە وەك ئاسمانەو نە وەك ڕۆژەو نە بیروباوەڕی ڕووت و پەتییە، بەڵكو مەوجوودێكە خاوەنی شەخسییەتەو دەگەڵ مرۆدا هاوسەركارەتی پەیدا دەكا، ئەدی ئەو هەموو سیفەتانە كە لە قورئانی پیرۆزدا بۆ خوداوەند گوتراون و بەدرێژایی چەند سەدە موعتەزیلەو ئەشاعیرە لەسەریان كێشەیانە، گەلۆ، خودا سیفەتەكانیشی وەكو زاتی خۆی «هەرهەبوون و هەردەبێ» یا هەر «زات»ەی خودا ئەو «هەر هەبووەو هەر دەبێ»یە، نەك سیفەتەكانیشی؟ ئیدی ئەوە بوو، بیری وا پەیدا بوو، كە زات و سیفەت (ئیمامی ئەحمەدی كوڕی حەنبەل) یەك شتن و كێشەكە بەم جۆرە بڕایەوە.... ئیدی بەم جۆرە ئاین بە شێوەی هەرە بەرزی گەیشت.. هەر لەمەشرا بوو كە مرۆ لەم هاوپێوەندی و

هاوسەروكاری و دۆستایەتی و خۆشەویستییەی دەگەڵ خودادا، دەستی لە ئارامیی دڵ و دەروون گیر بوو و لە ترس و دڵەڕاوكێ و پەژارەو هەراسانی ڕزگاری بوو.

٤- زەروان: چەند جارێ بە دوای ئێزەدانی دیكەدا نێوی هاتووەو یەكێ لەوانە بە مانای فریشتەی زەمانەی بێ سەرحەدو سنوور هاتووە. بە زۆری دەگەڵ سیفەتەكانی "ئەكران" (بێ سەرحەدو سنوور)و "در غو خوداتە" هاتووە كە لە [مینو خرد پازند]دا "زروان درنگ خدای"و لە نامیلكەی پارسیی (زانایانی ئیسلام)دا بە "درنگ خدای" گوتراوە، لەم دوو سیفەتە یێک هاتووە كە بۆ مانای زەمانە، سەرەتاو كۆتایی بە بیردا نەهاتووەو هەمیشە بە پایەدارو نەمر زانندراوە. لە "زاد سپرم"دا، بەشی (بەندی ٢٤) زەروان بەڕاشكاوی بە ئەفراندەی ئەهورامازدا لە قەڵەم دراوەو لە چەند ڕستەیەكدا كە لە ئاوێستادا هاتوون، تەنها لە پاش ئێزەدانی دیكەوە هاتووەو بە شایستەی پەرستن زانندراوە. لە نێوەڕۆكی ئاوێستادا وا دەبامرێتەوە كە زەروان بە مانای زەمانەی بێ سەرحەد و سنوورو نەمر دە كار براوە. لە عیبارەتێكدا لە گاتەكانی (یەسنا ٣٠، بەندی ٣)دا زەروان چاكەكارو بەدكار، وەك "دوو گەوهەری هاوزا" تاریف كراوە. لەبەر هەندێ، وا پێدەچێ كە زەردەشت باوەڕی بە ئەسڵ و سەرامەدێكی كۆن كە بابی دوو ڕۆح (ڕەوان)ی ئێوبراوی، كردبێ، وەلێ نازاندرێ كە زەردەشت بە چ نێوێكی نێو بردووە؟ بێ گومان لە پاشان، زەروان وەك پەروەردگارێ ناسراوە. لە سەروبەندی هەخامەنشییاندا لەسەر چییەتیی ئەم پەروەردگارە، بیروباوەڕی جۆراوجۆر هەبوون: هێندێ لەو باوەڕەدا بوون زەروان زەمانەو هێندێ پێیان وابووە، مەكانە. بەڵام لە پاشان ئەوەكەی دواییان زاڵ بووە. لە قورئانی پیرۆزدا، ئایەتی: «وما یهلکنا إلا الدهر» دیاردییە بۆ ئەم بەرەی زەروانییانە. ئەدی كوردیش تا ئەمڕۆ، ناڵێن: چەرخی چەپگەردو چەرخی سپڵەو گەردوونی بێ بەزەو تاد..؟! لە ئایینی میهرپەرستیدا باوەڕی زەروانی قەبووڵ كراوە. مانی كە بیروباوەڕی خۆی هەر لە زەردەشتیرا هەڵێنجاوە، زەروان بە خودای مەزن ئێو دەبا. هێندێ لە زانایانی ئایینی خوراسایی مەزدیسنا، هەر بە هەمان زەروانی لە قەڵەم دەدەن. نوسیارو مێژوونووسی سەدەكانی پێنجەم و هەشتەمی زایینی ئەم ئەفسانەیەی پایینیان لەسەر بیروباوەڕی ئێرانییەكانی سەروبەندی ساسانییان: كە چۆن گیتی دروستكراوە، نەقڵ دەكەن و سەروكاری بەم زەروانەوە هەس: زەروان، یەكەم خودا، هەزار ساڵی ڕەبەق كاوكەردوون و قوربانیی كێڕا، تا كوڕێكی بێ و هورمزی نێو بنێ، بەڵام پاشانەكێ بۆ خۆی لەسەر كاری قوربانییەكانی وە گومان كەوت ئەوجا دوو كوڕی لە زگیدا پەیدا بوون: یەكیان ئەهرەمەزد كە قوربانیی بۆ كردبوو، ئەوی دیان ئەهرەمەن كە بە گومانەوە قوربانیی بۆ كردبوو. زەروان بەڵێنی دا هەر كێیەیە لەو دوو

کوڕە پێشتری بە خزمەتی بگا، تاجی پادشایی لەسەر دەنێ. وەلێ ئەهرەمەن زگی بابی دڕی و خۆی بە خزمەتی گەیاند. زەروان لێی پرسی: ئەتۆ کێی؟ گوتی کوڕی تۆم. زەروان گوتی کوڕی من بۆن و بەرامەی خۆشی هەس و نوورانییە، وەلێ ئەتۆ تاریکستانی و بۆگەنی.. هەر لەو دەمی زەروان پێی لێ لە کزشی کرد، دەبێ خۆ نوورانی و بۆن خۆش کەی، ئەویش کردی. زەروان بە فرزەندی خۆی قەبووڵ کرد.

ئەهرەمەن بەڵێنەکەی وەبیری بابی هێنایەوە، زەروان وەڵامی دایەوە، بڕۆ، وا پادشایی نۆ هەزار ساڵم دە تەحەل کردی، پاش بەسەرچوونی ئەو نۆ هەزار ساڵ پادشاییە، ئەهرەمەزد دەبێ بە پادشای جیهان. ئەوە لەبیر نەکەی لە پاشانەکێ، زەروان دەگەڵ زەردەشت و ئەو هەرتکەش دەگەڵ حەزرەتی ئیبراهیمدا تێکەڵ کراون.

لەم ئەفسانەیەدا چەند شتێک هەن:

١- گومان و ڕارایی کارێکی خراپەو چی لێ شین نابێ.

٢- بەچکەی گومان ناشەرعییەو بە فرت و فێڵان خۆ دەسەپێنێ.

٣- ئەگەر ئەو بەچکە ناشەرعییە بە قسەی خودایەکەی کرد، لێی قەبووڵ دەکا و پاداشتی دەداتێ.

٤- زێتر دەستوپێوەندی فێڵباز و بێ بار و هەڵ خواز گەورەو خاوەن دەسەڵات لە خشتە دەبەن و وەک بێژی هیچی دەگەڵ ناکرێ. «تەزکەرەی ئەعلا»ی ئەهلی هەقدا، خوداوەند و حەزرەتی جبرائیل (بنیامین!!) لەسەر دروست کردنی حەزرەتی باوە ئایەم دەبن بە مشتومڕیان... بنیامین (بنی یامین!!) دەڵێ: «ئەتۆ سەروکارت بە دنیای ڕۆشنەوە هەس و من بە دنیای تاریکستانەوە. ئایەم دروست کردن، کە کارێکی تاریکستانییە، سەروکاری وە منەوە هەس، تۆ چکارەی!!» خوداوەند لەسەر ئەم بێ پەروایییەی بنیامین، سێ جاری حەفتا ساڵ - حەفتا ساڵ، دوور دەخاتەوە، تا لە پاشان ئاقڵی دەکا... ئەوجا کڕنووشی بۆ دێنێ کە هەر خۆیەسی و کەس لە خۆی وەولاوە حەددی هیچی نییە... ئیدی حەزرەتی ئایەم دروست دەکرێ. خولاسە، شەیتانەکەی خۆمان و بنیامینەکەی ئەهلی هەق و ئەهرەیەنەکەی کوڕی زەروان، یا هابیل و قابیلەکانی کوڕانی باوکە ئایەم هەر لە یەک بیروبۆچوونی (ئیمانی بێ خەوش) و (بڕوای گوماناوی)یەوە هەڵ قوڵیوە...

٥- مرۆ بێ بیر لە «دووانە» کردنەوە، کە ماکی «وجوود»ە لە سەرەتاشەوە و تا ئەوڕۆش نەیتوانیوە چتی (یەک قوتبی) لە مێشکیدا جێ بکاتەوە. (هەر ئەرێنی و نەرێنی)یەکەیە - سالیب و مووجەبەکەیە، مەنفی و موسبەتەکەیە، نێر و مێیەکەیە، کارەبا بەچکەی نەگەتیف و پۆزەتیڤە.

سەرچاوەکان:

١- ئەنسیکلۆپیدیای ئازەربایجان (ACE).
٢- فەرهەنگی فەلسەفەی ماتریالیزم (materyalist felsefe sozlugu).
٣- لغتنامه‌ء دهخدا.
٤- تاریخ ادیان و مذاهب جهان/ مبلغی آبادانی.
٥- بودا/ ع. پاشائی.
٦- تاریخ اجتماعی هنر/ هاوزر/ ترجمه‌ء ابراهیم یونسی.
٧- الفصل فی الملل والأهواء والنحل/ ابن حزم.
٨- تاریخ ده هزار ساله‌ء ایران/ عبدالعظیم رضائی.
٩- هند در یک نگاه/ دکتر محمد رضا جلالی نائینی.
١٠- فرهنگ نمادها/ ژان شوالیه الن گربران/ ترجمه‌ء سودابه/ فضایلی.
١١- تاریخ تصوف در کردستان/ محمد رئوف توکلی.
١٢- ئورتانی پیرۆز.
١٣- سەرمایە. کارل مارکس/ ترجمه‌ء ایرج اسکندری.
١٤- عادات و تقالید الشعوب القدیمة/ د. فاضل عبدالواحد - د. عامر سلیمان.
١٥- نخستین انسان و نخستین شهریار/ آرتور کریست سن در تاریخ افسانه‌ای ایرانیان/ ترجمه‌ء ژاله آموزگار- احمد تفضلی.
١٦- مەم و زین/ ئەحمەدی خانی.
١٧- ادیان و مکتبهای هند/ داریوش شایگان.

١٨- قصه، ارباب معرفت/ عبدالكريم سروش.
١٩- تاريخ بزرگ جهان/ كارل گريمبرگ/ ترجمه، دكتر سيد ضيا ءالدين دهشيرى.
٢٠- تعوراتى پيروز.
٢١- تاريخ اديان بزرگ /هاشم رضي.
٢٢- أعلام فرهنگ معين.
٢٣- وهابيت و ريشهاى لن/ نورالدين چهاردهى.
٢٤- رياض المشتاقين/ مخطوطة.
٢٥- الأساطير القديه فى التورات، د. علي الشوك.
٢٦- تأريخ الشعوب الإسلامية/ كارل بروكلمان.
٢٧- جنبش حروفيها/ محمد قطروس.
٢٨- دائرة المعارف الإسلامية. (التصوف) باللغه التركية.
٢٩- فربه تر از ايديولوژى/ عبدالكريم سروش.
٣٠- تصوف و ادبيات تصوف/ يوگنى ادواردويچ برتلس.
٣١- قبض و بسط تئوريک شريعت/ نظريه، تكامل معرفت دينى/ عبدالكريم سروش.
٣٢- اسرار التوحيد فى مقامات شيخ ابو سعيد ابو الخير / باهتمام حسين بدرالدين. پەراوێزی ل: (٢٤٢)

له بەشی یەکەمدا قسەمان له ئایینه سەرەتاییەکانی وەک: فتیشیزم، ئانیمیزم، تەوتەمیزم کرد. پاشان لەمەڕ ئایینی زەردەشتی و ئایینەکانی دیکەی مووسەوییەت و عیسەوییەت و ئیسلامەتی کرد، هەروەها دیاردیان بۆ زۆر ئۆل و مەزهەبەکانی ئیسلام کرد و ناو بەناو نموونەمان لەبۆ دەورو کاریگەریی ئەم ئایینانه (له بیروباوەڕی کوردەواریدا هێناوەتەوە). قسەشمان لەوە کرد که مرۆڤ هەر له بەرەبەیانی پەیدابوونییەوە بێ ئایین نەبووە و خوداپەرستیی تێدا وەک خوێنی لەشی بە شارەگیدا گەڕاوە.. لەم بەشەدا کە بەر قۆناغی کۆمەڵەکیی مێژووییە، واتە: قۆناغی شارستانیەتیی بەرەی مرۆڤ دەکەوێ، قسە دەکەین. دیارە له بەشی یەکەمدا، باسەکە زێتر باری وەسفیانەی وەخۆوە گرتییە، خۆ تێدا لێ بەخێوی ئەم باوەڕ، یان ئەو باوەڕ کردن و پاساودانی ئەمەهێ و ئەوەهێ دەبەرچاو نەگیراوە، بەڵام لەم بەشەدا پتر پێ لەسەر شی کردنەوە و پاساودان و ڕاست کردنەوەی ڕاو بیروباوەڕی چەوت و چەوێڵ له مەڕ مرۆڤ و چۆن بیرکردنەوەی وی و چۆن لەخۆ گەیشتنی وی دادەگرین. لێشت وەناشێرم، ئەمن لە بیرو بۆچوونەکانمدا پشت بە ماتریالیزم، نەک میتافیزیک و ئایدیالیزم دەبەستم. ئەوجا با وەگەڕێینە سەروبەندی هەرە سەرەتای پەیدابوونی تیرەی مرۆڤ. مێژووی مرۆڤ بە پەیدابوونی مرۆڤ و

کۆمەڵی مرۆڤ دەست پێ دەکا. زانستمەندانی ئایدیالیست مەودایەکی دوور و درێژە کە لە جیهانبینیی «بەهێڵی سوور» یان «تخووبی لە بەزین بەدەر»ی نێوان مرۆڤ و گیان لەبەران لایەنگری دەکەن. یەژن: مرۆڤ چتێکە و گیان لەبەر چتێکی دیکەیە. ئەم جیهانبینییە لە ئەفسانەکانی کتێوی پیرۆز (سەروبەندی کەونارا)، واتە: تەورات و سەروبەندی نوێ (ئینجیل) کە بەم پێیە خوداوەند مرۆڤی «لە شێوەی خۆی گوورانددووە» هەڵێنجراوە. داروین کە بەپێی گریانەکەی خۆی دەڵێ: مرۆڤ لەبەرەی گەشەکردووی مەیموونی مرۆڤ نوێن (ئانترۆپۆمۆرف - anthropo-mophe - هاتۆتە گۆڕێ، بەمە لە دژی ئەم جیهانبینییە ڕاسیا. هەرچی پەیجۆری و دۆزینەوەکانی پاشانەکێش هەن، ئەوە بیروڕای ویی پشت ڕاست کردووەو و بە دیاری ئێخست، کە لە دوادوای سەروبەندی سێیەمی زەوین ناسیدا، یا سەرەتای سەروبەندی چوارەمدا، ڕاستییەکەییت گەرەکە جۆرە مەیموونەیلێ هەبووگن، کە دەشێ ئەمانە وە باپیرە گەورانی مرۆڤ لە قەڵەم بدرێن. دوور مەرۆ لە باشووری ئەفریقا کۆمەڵە هێسکێکی زۆر لە مەیموونەیلێ کە بەنێوی نوسترالۆپیتیک (بە زمانی یۆنانی «مەیموونی باشووری») - Australopitique -وە نێونراون، وەگیر کەوتوون. ئەم مەیموونانە لە ئاران و دەشتی پڕ دار و درەختاندا دەژیان، بەسەر پێوە دەوەستان و دەڕۆیشتن، زیندەوەری چکۆلە و گەورەیان ڕاو دەکرد و بۆ هەڵمەت و بەرگری لەخۆ، داردەستێ یا ئێسکێکی ئەستووری زەلامیان بە دەستەوە بەکار دەبرد، خۆراکی لە بابەتی گۆشت. بەسەر پاشووەوە ڕاوەستان و بەکار ئێخستنی ئەندامانی پێشەوە لەبۆ شت پێ گرتن، ئەمانە سەرلەبەر، بەلای گەورەبوونی مێشکیدای وەکێشا.

جا پرسی: داخوا نوسترالۆپیتیک باپیرە گەورەی بێ چەند و چۆنی مرۆڤە یا لە پێواژۆی پێکهاتنی مرۆڤدا (وەچەیێ یێک دێنێ؟) قسەی بێ مشتومڕ ئەوەیە کە مرۆڤی بەردوارە - homm fassile - لەو مەیموونە ڕەسیوە هاوشێوانەی کە کۆمەڵە ئێسکەکانیان لە زۆر شوێنی ئەملاو

ئەولای جیھانی کۆن، ئەمازا لە قەفقازدا، دۆزراونەوە، ھاتووەتە گۆڕێ. لەنوای سەروبەندی چاردەمەوە (نزیکەی بەر لە میلیۆن سالی خشت) گەلەوڕانی مرۆڤەیلی سەرەتایی، جێی مەیموونەیلی مرۆڤ ئاسایی - An- thropoides - یان گرتەوە. کێشەی ئەوەش داخوا لە کێهە ناوچەی دنیایێ پێواژۆی مەیموون بە مرۆڤ بوون، ڕووی داوە، ئەمە بگرەو بەردەی فرە لەسەرە.

برێ لە زانستمەندان بڕوایان بە ڕامانەی پۆلی ژنیسم - Poly- genisme - هەیە. ئەم ڕامانەیە ئەوە دەگوردێنێ کە پێواژۆی مەیموون بە مرۆڤ بوون، شان بە شانی یەکدی لە چەند شوێنی ڕووی داوە و مرۆڤ لێل جۆرەیلی جوێ- جوێی مەیموونەدا خزمایەتیان هەس. وەلێ زانستمەندانی ڕووس ئەی ڕامانەیە وە دوا دەدەنەوە، لە گۆشەنیگای ئەوانەوە، گۆڕانی مەیموون وە بنیادەم لە بەشێ لەسەر زەوینێکی پان و بەریندا کە ئاسیا، ڕۆژهەلاتی نێزیک، پشت قەفقاز و ناوچە کاکی بە کاکییەکانی ئەفریقا، دەگرێتەوە، ڕووی داوە، زانستی ئەوڕۆ ڕێ خۆش دەکا کە بەرسڤی ئەم پرسە بە وردتر بدرێتەوە. برێ لێوە کۆلان، پەیدابوونی مرۆڤ دەبەنەوە سەر هۆکارگەلی بە ڕێکەوتی لە خواسایی بەدەر. وە نموونە: ئەکادیمیستێ پ. سوشکێ - p. Soushkine - لە ناوچوونی جەنگەلستان و لێرەواران بە هۆکاری چارەنووس و دیاریکەر لە قەلەم دەدا. بەڕای وی، گۆڕانی بارودۆخی دەوروبەر کە مەیموونی بە زۆرەملێ ناچار کردووە لەسەر بسات گوزەران بکا ئەم ئاکامەی لێ کەوتووەتەوە کە ئەندامانی لە یەکدی جوێ بکاتەوە و ناچاری بکا بە ڕاوەستانەوە لەسەر هەردوو لاقی بڕوا. ئەم تێئۆرینە، ڕامانەی گۆڕانی ڕێکوپێکانەی مەیموون بە مرۆڤ بوونی بەرپەرچ داوەتەوە. شرۆڤەی زانستمەندانەی ئەم دیاریدەیە لە سای فەردریک ئنگلسەوە لە کتێوی ئەخش و کاریگەریی کار لە گۆڕانی مەیموون بە مرۆڤدا، بە ڕوونی نووسراوە. خاوەن کتێوەکە دەفەرموێ: «کار» لە گۆڕانی مەیموون بە مرۆڤدا هۆکارێکی ڕەسەن و کاریگەرە. دەلێ خودی مرۆڤ

«کار» گووراندوویە و هێناویتییە گۆڕێ. وەلێ ئەی کاری مرۆڤە لە کوێڕا دەستی پێ کردووە؟ مەیموونان دەیان کاری تەوەنێ، کەورێ، خرکێ، یان گالۆکێ، داردەستێ بە دەستەوە بگرن. مەیموونەکانی باشوور توانستی ئەی کارەیان هەبووگە، ئەما، هیچ مەیموونێ نەیتوانستگە تەنانەت ساکارترین ئامێرو ئەوزارێ دروست بکا. خۆ هەر وە سازدان و دروست کردنی ئامێر و ئەوزارەکە کار دەست پێ دەکا. وەبێ ئەوزار هیچ کارێ ناکرێ. مرۆڤ وە ئەوزار و ئامێر قەرەبووی چنگۆڕک و کەڵبەی کردووەتەوە.

چالاکی دە کارو سازکردنی ئەوزار و ئامێرگەلی سەرەتاییدا دابەشبوونی کار و ئەرکەکانی دە نێوان ئەندامانی پاشەوە و پێشەوەدا، لێ دەکەوێتەوە. سازکردنی ئەوزار دەبێ بە ئەرکی تایبەتی ئەندامانی پێشەوەی و ئەم کارەش دەبێ بە مایەی ئەوە کە دەستوبرد و مەهارەتی وان پەرە پێ بدا و بگۆڕێن بە دەست. بەم پێیە «دەست نە تەنێ پێناوی ئەنجامی کارە، بەڵکو بەرهەمی کاریشە».

بەرە - بەرە کە دەستی مرۆڤ بە کارەوە پتر ڕادێ و مەهارەت و دەستوبرد زێتر دەردەست دەکا، خوو و خدەی بەسەر پێوە ڕاوەستانەوە، بە ڕێوە ڕۆیشتنەوەی تا دێ بەهێزتر و بەگوردتر دەبێ. جا ئەی کارە وە نۆرەی خۆی لە سەرێکەوە بە لای ڕەسیوی و کامڵ بوونی دەستیدا دەشکێتەوە و ئەمانە لە جێوەجێکردنی چالاکییەکانی بابەتی کار ڕاپەڕاندندا، ئازاد دەکاو لە سەرێکی دیکەوە ڕەسیوی و فراژوو بوونی گەروو و تارو ڕایەڵە و ژێیەکانی دەزگای دەنگ، ئەو کارە سانا دەکا.

لە کۆمەڵە سوقانەیلی مرۆڤی وەبەرد بووگ (فۆسیل) وەکۆڵین، وای بە دیار دەخا کە لێکدی جوێ بوونەوەی ئەندام و پیلان، بەو مانایە کە هەریەکە کار و فرمانێکی ئازادانە و تایبەتی بۆ دەرەخسێ، بەر لە ڕەسین و فراژوو بوونی کاسەسەر، ڕووی داگە.. ئەم مەبەستە ڕامانەی ئنگڵس لەمەڕ ئەخش و کاریگەریی کار لە پەیدا بوونی مرۆڤدا، بە باشترین شێوە دەستەک دەدا.

بەش وە حالی بەردواره، ئەوە غوونەگەلی پاشماوەکانی هەرە کەونارای مرۆڤی وە بەردبووگ بەنێوی پیتیک ئانترۆپ - Anthrope .p- یان مەیموون - مرۆڤ، لە سالەکانی (١٨٩٠-١٨٩٤)دا، لە جاوە دۆزرایەوە. پاشانەکێ هەر لە هەمان شوێن غوونەگەلی دیکە پیتیک ئانترۆپ وەگیر کەوتن. لە سالی (١٩٢٥)دا دێرینە ناسی چینی پی نون چونگ ناو لە شکەفتێکدا بەنێوی شۆکۆتێن، لەنێزیکیی پکەن، (٢٥) پاژێ جوێ - جوێش جێی هێسکی مرۆڤی بە بەردبووی پەیدا کرد کە بەنێوی سین ئانترۆپ - Sinantrope - مرۆڤی چین - نێونرا. لە مەلبەندی ڤیەتنام، لە باشووری ئەفریقا و نزیکی هایدلبێرگ - Heldeberg - لە ئالمان چەند پارە ئێسکێ و لە هەمـوویان گرینگتر برێ چەناگە و شەویلاگە و ددانی مرۆڤ دۆزرانەوە کە زێتر وەکوو ئی مرۆڤی چین دەچوون، کە لە (١٩٤٤)دا، دێرینەناسانی فرەنسی دە نزیکیی جەزائیری پاشماوەگەلێکی غوونەی دیکەی مرۆڤی پێش مێژووی وەدەست هاورد کە بەناوی ئالتان ترۆپ - Altantrope -ەوە ناوی دەرکرد.

بەرە بابەکانی پاشینەی بێ کێشە و چەندوچونی مرۆڤگەلی بە بەردبوو، نیاندەرتالەکانن. بەر ماوەی ئەم جۆرە مرۆڤە دە سالی (١٨٥٦)دا لە دۆلێ بە نێوی نیاندەرتالەوە، لە نێزیک دسلدرۆف دەردەست کراو و هەر بەو ناوەشەوە ناوی دەرکرد.

نیاندەرتالەکان لە دنیای کەونارادا پەرت و بلاوبوون و پاشماوەکانیان لە جاوە، ئەفریقا، ڕۆژهەلاتی نێزیک و لە چەندین جێگای نێزیک و جوێ - جوێی ئەورووپایێ بەرچاو دەکەوتن. لە ولاتی شۆرەویی جارانێ پاشماوەی ئەم جۆرە مرۆڤە، بەهۆی دێرینەناسانی شۆرەوییەوە، دۆزراوەتەوە؛ دە سالی (١٩٢٤)دا گ. یونج ئۆسمۆلسکی پاژەکانی ئێسکەندی نیاندەرتالێکی لە شکەفتی کیک کۆبا، لە کریمێ دەردەست کرد. هەروەسا لە سالانی (١٩٣٨ - ١٩٣٩)دا ئا. ئۆکسلادنیکۆف هەستیێن زارۆکێکی نیاندەرتالی لە شکەفتی تیشک تاش، لە

باشووری ئوێزبەگستاندا، بە دەست نانی. مرۆڤی بەردوارە لە مرۆڤی ویستاکە کە هەنیەیەکی شۆڕ و تەپڵەسەرێکی کورتیلەی هەبووە، تاقی برۆی پەیوەست و بەسامی بەسەر چاوانیدا سوارە، هەستییێن چەهرەییێن وی پڕ زەق و زۆپ بوویبە و چەناگەی بۆ ژووری ڕۆچووە. مرۆڤێ ب کەڤربوویی ب چۆکێ ڤەنوشتای شاقاوی هەڵ دینا دە کاتی دەو و بەزین و هەراکردندا هەر بە تەواوەتی بەرەو پێشێ دادەنەوی و دەڕۆیشت. دەستەکانی وەک پەنجە دەچوون، واتە کەڵەنگوستی لەوەی کە لە مرۆڤی ئەوڕۆدا دەدیترێ کەمتر هەمبەری ئەنگوستەکانی دیکەیدا بوو. سەرەڕای وەش سەرلەبەر، مرۆڤی بە بەردبوو (فۆسیل) لە ڕووی بەرێوە ڕۆیشتێ و دەفرێتیی کاسەسەر، لێل مەیموونە وە پلە هەورازترەکاندا فرە جیاواز بوو. بارست (قەبارە)ی مێشکی پیتیک ئانترۆپ، مرۆڤە مەیموون (٩٠٠ سانتیمەتر شەشپاڵوو) لە چاو گۆریل و ئوسترالوپیتک، مەیموونی باشووری، بە چەندین پلە گەورەتر بوو و مێشکی سین ئانترۆپ- مرۆڤی چین- دیسان هەر بارستی قەبەتر بوو (١٢٠٠ سانتیمەتر شەشپاڵوو) و مێشکی مرۆڤی نییاندەرتاڵ (نزیکەی ١٤٠٠ سانتیمەتر شەشپاڵوو) لە دەفرێتیی مامناوەندیی کاسە سەری مرۆڤی ئەوڕۆکەوە (لە ١٢٠٠ تا ١٥٠٠ سانتیمەتر شەشپاڵوو) نێزیک بوو.

مرۆڤەیلی وەکەمەر بووگ، وە بەرەواژیی ئوسترالوپیتیک، نەک تەنێ دەسکاریی (داردەستێ، گاڵۆکێ لە پێشە)یان دەکرد، بگرە دەیان توانی نامێرو ئەوزارانیش ساز بکەن، هەروەک لە نامێرە وەکەمەر بووگەکانی نێوان پاشماوەکانی مرۆڤی چین و نییاندەرتاڵان بە دیاری دەخەن. کەوناراناسان ئەو نامێرو ئەوزارانەیان لە گەلەک شوونان، بێ پاشماوەی پێشەی مرۆڤی وەتەوەن بووگیان دۆزیوەسەوە. دەورانێ کە پیتیک ئانترۆپ و سین ئانترۆپ لەو شوونانەدا دەژیان دەورانەکە دەورانی پالیۆلیتیکی کەڤنارای دێرینە.

خۆ هەرچی سەروبەندی کۆنە بەردینی دێرینە ئەوە دە سەرەتای چاخی

چارەمی زەویناسـیدا، سەروەختێ کە کۆمەڵی مرۆڤەیل بۆ یەکەمین جار پێیـان دە گۆڕەپانی پەیدابوونێ نا، بارودۆخی هەرێمیی زەوین لە بارتر و تەڕ و شێـدارتر بوو: ئەورووپا جـەنگەڵسـتـان و لێـرەوارو و چرسـتـانانی گەرمەسـێرەکان دایان پۆشیبوو و پڕی بوو لە بەوری جۆری ئاماشرودۆس و فیلی بابەتی پرۆبوسیدین و کەرکەدەنی تەرحی ڕینۆسرۆس کە لەم زەمانەدا نەمـاگن. بەرانەکـینێ وە دەم گـوزەری ڕۆژگـارەوە هەلومـەرجی ئاووهەوا سـەخـتـتـر و دژوارتر گـەڕا: چاڵە بەفـر و سـەهۆڵبـەندان کـە لە باکـوورڕا داخزیبوون، تا دەهات بەرەو پێشترێ ئاژن و شالاو و هاشاولـیان دەهێنا و کاژێکی ئەستووری شەختە و بەسـتەڵەک و سەهۆڵبەندان، سـەرزەوینانی پان و بەرین و کاکی بە کاکیی ئەورووپا و ئەمەریکای باکووری گرتەوە. چاڵە بەفرەیلی دیکەش لە کوێستانەکانی زنجیرە چیایەکانی ئەلبورزو هێمالایا سـەرەونشـێـو دەبوونەوە. هەر لە پاڵ چاڵە بەفـرەکـاندا لێـرەواری ژێر نیمـتیواییەکان لەنێو چوون و «توندرا»یەکان (زەلکاوی بێ درەختی وەک ئی نووکی زەوی (قـوتب)، جـێی وانی گـرتەوە. لەم توندرایانەدا گـەلە مامووتی بەخوری، گاکێوی و ئەسپی کێوی بلاو بوونەوە. سەروبەندی کۆنە بەردینی دێرین، بە وردی، سەردەمێکی دەگرێتەوە کە لە سـەرەتای چاخی چارەمـڕا دەست پێ دەکـا و تا پایینی دوا تەشـەنەکـردنی چاڵە بەفرەکـان (نێزیکەی چل هەزار ساڵ بەرێ) درێژا دەکێشێ.

سنعەتی دەستکردی مرۆڤ لە سەروبەندی کۆنە بەردینی دێریندا قۆناخی سـەرەتاییـانەی خـۆی بڕی. جگە لەبەردەسـتێ، پاژە بەردی مـەودا تیـژی بەکـاردەهێنا. کـەم کـەمـە، داتاشـینی تەوەنی مـشـتـە لەبەردەستێ بوو بە چتـێکی خـواسـایی و ئەوەی چەکـێکی بەردین بوو لە شـێـوەی چواڵە کـە درێژییەکەی بە (٢٠) سانتیمەتر و کێشی بە (٢٠) کیلۆگرام دەگەیشت. ئەم بەردانەیان بە کۆمەکی بەردەستییەکانی دیکە دادەتاشین. ئەم ئەوزارە سـەرەتاییـانە لەبۆ سـازکـردنی مـێـخی دارینە، ڕەگ و کـۆتە و کـۆتەرە هەڵکەندن، لانە و کاشانە ڕماندن و جانەوەر و دڕندەکوشتن و زامدار کردن

وه کار نەهاورد. پێ دەچێ ئەم بەردەمشتانەیان یەکراست بۆ ڕاووشکار وەکار نەبردبن؛ چون ڕەنگە گورز و گاڵۆک، یا کوتەکێ، کوتکێ، تێلایێ، گاڕانێ لەبۆ ئەم کارە لەبارتر بووبن. سەرباری بەردەمشتە، زوێڵەگەلێ لەبەردەستێی بڕندە سازدەکران کە بۆ ساودان و تیژکردنی ئەوزارەکان بەکاردەبران. وردە - وردە ئەزموونەکان باری شایستەتر وە خۆوە دەگرێ، تەکنیک بەرەو پتر پەرەساندن و گەشەکردن و ڕەسیوی دەچێ. مرۆڤگەلی سەرەتایی لەناوچەی جوێ - جۆیدا و بەشێوەی جۆراوجۆر ئەوزاری چکۆلەتر و ڕێکوپێکتر و زەریفتریان لەبۆ فەراهەم دەبوون. ئەوزاری هەرە سەرەکیی نیپاندەرتالان لە شێوەی زوێل و تەڵەزمی سێگۆشە لە بەردەستێ دێنە گۆڕێ. نووکەکەی بۆ چت تیژکردن و کون کردن و مەودایەکەی بۆ پۆست کەوڵ کردنی جانەوەرکوشتن بەکاردەبرێ، ئەوزارو ئەسپابی ڕاووشکار، چەنگاڵ و نێزەو ئەجاخی دارینەن.

مەیموون - مرۆڤەکان، لەوە دەچێ نە پاسار و پەنایێ و نە پۆششت و پۆشاکێکیان هەبووبێ. زانایان وای بۆ دەچوون، کە مەوداو چەنانێکی دوور و درێژ، دە پەنای دارو درەختی وەشارتیدا خۆیان لە گەرو گێچەڵ و گۆڵمەزی جانەوەری دڕندە، وەلادابن. ئەوجا پاشانەکێ مرۆڤ هینی ئەوەبوو کو خۆ لە ڕەشەبا و زریان و باهۆز و بۆران بپارێزێ... سپەرو سەنگەرو لەمپەرەیلێکی ئەڕای خۆی دۆزییەوە. دەستی بەسەر ئەشکەوتەکانی جانەوەرانی دڕندەدا گرت و لێی داگیرکردن و لەو ئەشکەوتانەدا هێوری و ستاری گرت. لە پێستەی جانەوەران، ئەڕای ڕایەخ و پێخەو و پۆشاک و جلوبەرگ، کە بۆ خۆی جۆرە کەرک و کورک و کەوڵ و پەلاسێ بوو و بە بەن و خرێنە و داو تێک دەبەستران، سوودی وەردەگرت.

مرۆگەلی سەروەختی کۆنە بەردینی دێرین، سوود لە ئاورووەرگرتن فێربوون - ئەدی ئەڤە چاوا بوویە؟ لەوە دەچێ، پێشان کەڵکیان لە ئاوری خواسایی و خۆڕسکی وەک: گرکان و سووتمانان وەرگرتبێ و چاودێرییان کردبێ و ئینجا کاربێتیان، سا یا بە پێکداداانی دوو بەردەستێ بە یەکدیدا یا وە

مالشتدان و لێک خشاندنی دارو درەخت، پەرژاینە ئاورهەڵایساندن. لە گەرمەی مالشتدان و دار و درەخت لێک خشاندندا، خاکەیەکی وردی نەرمی، کە لەدار و درەختە هەڵایساوەکان هەڵ دەوەری، گەرم دەبوو و ئاوری دەگرت، هەنگێن پلیتەیەکی لە خوری، یا پووشوو و قاو و توێکلی دار و دەوەن و کرۆکەداریان لێک نێزیک دەئێخستن و هەڵیان دەگیرساندن و ئەوجا بەفوو دەیان دەماند و ئاگرەکەیان وە گرو بلێسە دەئێخست، ئاور هەی ئاور... دە بەرابەر سەختی و دژواریی ئاور هەڵایساندندا، مرۆڤ ناچار دەبوو، بۆ وەی ئاوری لێ نەتەمرێتەوە و دانمرکێتەوە و نەکوژێتەوە، چاوێری و پاسەوانیی لێ بکا

سوود لە ئاور وەرگرتن چتێکی فرە وە بایەخی وەدەمەوە بووگە و نێستەکەش هەس؛ ئایێر (ئاگر) ئەڕای ئایەم لە وەی و گەزن و بڤەی سەرماوسۆڵە و دڕندە و پیاوخۆر پاراستن، تا بێژی قیمەتی تەواو ناوێ. خۆراکی لەبەر دەبرژێنێ، کەبابی لەسەر دەکا، چێی کاڵ و کرچی لەسەر دەکوڵێنێ، خۆلاسە کاری زۆری لۆ سانا دەکرد.. هونەری ئاورهەڵایساندن بۆ یەکەم جار دەسەڵاتی بەسەر یەکێ لە هێزەکانی خۆرسکدا ڕۆیشتنی بە مرۆڤ بەخشی و لەوێرا بۆ هەمیشە و هەتا هەتایە لە سەرلەبەری گیان لەبەرانی دیکەی جوێ کردەوە(١).

لە شۆرەویی بەرێ، کەوناراترینی ئەوزارەکانی مرۆڤی بەردوارە لە گردەکانی ساتانی دار، لە ئەرمەنستان دۆزرایەوە. ئاسەوارێکی دیکەی سەروبەندی کۆنە بەردینی دێرین لە قەفقاز، لە نوێزیەگستان و لە باشووری ئۆستی، لە کرێمێ لە گۆلاوەکانی دنێپەر و بەشی نێوان ڤۆلگا وەدەست کەفتن.

بەڕاستی ئەوەی سەرنجیزوێنە، لە کوردستان بەش بەوەندەی بەندە لێی ئاگام، لە ناوچەی قەرە حەسەن لە سەرووی گوندی تەپە سەوزەوە، کە مەڵبەندی شێخانە، بە بلیندایەکی بەرانبەر جەوەڵناساز، بە هەزاران سەرە ڕمب و سەرە نێزەی لە بەردەستێ داتاشراو، تا وێستاکەش هەر وەو

بانەوە ماون. گردە شێخەیی ئەوبەری بەستەکەی پێش گوندی مەحمەشا (مامشە) بەرانبەر بە گوندەکە، کە جۆگەیەکی چکۆلەی بە بندا دەڕوا، تا سەردەمانێکی من ئاموشۆی گوندەکەم دەکرد و بەعس ئەنفالی نەکردبوو، ناو بەناو کە ناو گردەکەی بنکەن دەکرد ئاسەواری لە گلێنە و بەرد و شاخی کێوی لێ بە دیار دەکەوتن. خەڵکی ئەو گوندانە بە زۆری ئاوریان بە قاوچەخماخ و بەردە ئەستێ دەکردەوە... سبیلکێش زۆرینەیان تا چەرخ و شقارتە و شەمچە پەیدا نەبوون، بە بەرد و ئەستێ سویل و قەنەیان دادەگیرساند. ئێمەی منداڵی ئاوایی کە خرەکە بەپێش گوندەکەدا بەرەو خوار دەڕوا، هەمیشە بە بەرد بە یەکدی داداندا سەرقاڵ بووین و پریشکە ئاورمان لێ وەدەست دەهێنا و کەیفمان بەو کارە دەهات. ژنان کوورە ئاوریان لە گڵ دروست دەکرد و گلێنەیان پێ دەگوت. لە بنە قالۆری زها و نیشک و کرۆکی داری پووکاو و پووچ و پووت، قاو و پووشیان ساز دەکرد. مشتووی چەقۆ و قەڵەمبڕ و سیکارت و کێرد و خەنجێریان لە شاخی کەڵەکێوی و گا و نێری دروست دەکرد. کەڵەشاخیان بە شاخی کێوی دەگرت. خوێنیان بە زەروو بەر دەدا، دۆڵ و دەسکە دۆڵیان لەبەرد ساز دەکرد، چێتیان بە سەنگ و تەرازوو دەکێشا. سەنگیان لە بڕبە و گۆترە گەلاڵە دەکرد، ساواریان لە چاڵێکدا کە لە تاوێرەکانی پشت ئاوایی هەڵ کەندبوو، دەکوتا. ئاسیاوەکەی سەرحەد لە ڕۆخانە (ئاوەکەی لە دەربەندباسەرەوە سەرەونشێو دەبێتەوە) بەرداشەکانی هێندێ جار هەر لەو ناوە دروست دەکرا، دەستهاڕ زێتر خۆیان دروستیان دەکرد، هەروا سا دنگ، دۆڵ، دەسکەدۆڵ، ئەمانەیلەش هەر هوێشیان دروستیانشان مەکەردن.

بە مەزەنەی بەندە ئاوری پیرۆزی باوەگرگر لە کەرکووکێ فرە کۆنەس.. خەڵکی ناوچەی زاموا، هەر بۆ یەکەم جار بە ئامەدەیی و حازرەکی و خۆڕسک سوودیان لێ وەرگرتووە - دوور نییە، پێش وەی مرۆڤ ڕێی کەوێتە ئەو ناوچەیە: ئەو ئاگرە هەر لە کۆنەوە هەبووبێ. بۆ خۆی نێوی «باوەگرگر»، زمان خواران بە «بابەگوڕ گوڕ»ی یەژن، زوانیان بوڕێ...

زەرتوشتییان ئاوری ئاورخانە (ئ: تشکدە)کانیان نەدەکوژاندەوە، ئەوەش لەوەڕا کەوتبۆوە کە مرۆڤ وەختێ ئاوری هەڵدەگیرساند، نەیدەویست لێی کوێر بێتەوە و بتەمرت؛ چون ئەسپابی ئاورهەڵایساندنی بەوی ساناهیێ دەست نەکەفتیە، گاڤا کو خاستبێت هەڵی بکا، یەکسەر هەڵیگیرسێنێ، لەبەر هەندێ ئاورخانان پاسەوان و چاوێرییان بۆ داناوە و هەمیشە پاراستوویانن.

قسە قسە دێنێ، ماڵە میر و بەگلەری کوردان ئاورخانە و وەجاخیان هەرگیز نەکوژاوەتەوە و هەمیشە دووکەڵی لێ هەڵستاوە. کەسێکی منداڵ و دۆمۆنیی نەبێ وێستاکەش لە کوردەواریدا خۆی بە وەجاغ کوێر و نەستێور دەزانێ، ئەمەش لە قۆناخێکەوە کە پیاوی تێدا لە جیاتیی ژن بوو بەخێوی هەموو دەسەڵاتێ، ئاو دەخواتەوە. کەسێکی دەسکورت، یا پیسکەو ڕژد بێ، پێی یەژن: ئاوری لە ماڵێدا ناکرێتەوە، دووی لەخانەی هەڵ ناستێ، خانەوێرانە..

بەش بە حاڵی ئایین ژیان و سازمانی کۆمەڵەکیی کۆمەڵی مرۆڤەکی دەتوانین بێژین پاشکەفتیترین هۆز و تیرەگەلێ کە ئێتنۆگرافییان لێیان وەکۆڵیون بە چەندین پلە و پایە لە مرۆگەلی وەتەوەن بووی کۆنە بەردینی دێرین پەرەیان ساندگە و وەگەشە کەفتگن. لەم ڕووەوە چۆنیەتیی ژیان لەناو کۆمەڵانی سەرەتاییی مرۆڤدا تەنها و تەنها لە ڕووی ماتریاڵ و بەرژەوەندەکانی دێرین ناسییەوە وەگیردەکەوێ و هەر لەبەر هەندێکەش راوبۆچوونەکانی مە لەمەڕ سازمانی کۆمەڵەکیی وی ناتەواوە و لەسەر هیمی گرێمانە و قیاس کردنێیە..

مرۆڤ لەسەروبەندی کۆنە بەردینی دێریندا، وە گردوکۆی خۆراکی - Cuillett - و ڕاووشکار بەڕێوە دەچوو - بە میوەو ڕیشەی دار و درەخت و واردەنیی وەک: توو، تووترک (گاتوو، توورک، دڕی)- baie - وەڕێوە دەچوو. مەمکداران (پستاندار)ی چکۆلە، مارمێلکە و گەپلە و بزمژە و قوڕی و گەزندە و خزندەی ڕاو دەکرد و فرەی نەخایاند پەرژایە ڕاوکردنی

گیانلەبەری گەپ و زل. دێرین ناسان لە هەوارگایەکانی بەر لە مێژوو، بە زۆری لەناو ئەوزار و ئامێرەیلی نواییندا، پێشەو هەستیی مامووت و گامێشی کێوی - Bison - و ئەسپ و گاکێوی دەدۆزنەوە کە مرۆڤەیلی سەرەتایی، ژبۆ ئەڤێ یەکێ کو مۆخی نێو ئەم هەستی و پێشانە دەرێرن، قەلاشتوونیان. مرۆڤی سەرەتایی گۆشتخۆریش بووەو گیاوگۆلخۆریش بووەو لەم ڕووەوە بۆی لواوە کە وەزۆری بتوانێ لە گشت جێێ بژێ و هەل بکا.

بارودۆخی ژیانی مرۆڤ سەخت و بە سام بووە، نەیتوانیگە لێل دڕندەگەلی هەراسانکەری سەرەتای سەدەی چارەمدا پێشبڕکێیان لێلا بکاو پەنجەیان لە پەنجە بدا، نە لەز و خێرایی وان و نەهێز و گوردی لەش و لاری وانیان هەبووە. برسیتی و مەرگی ژێر چنگوڕکی جانەوەرانی، هەمیشە لۆ لە بۆسە و کەمیندا بوون. ئاژن هاوردنی چالە بەفران ململانێی وی دەگەل خۆرسکیشدا هێندەی دیکە دژوارترو مەرگەساتتر کرد. وێڕای ئەوان هەمو کۆسپ و هەلەموتان، بنیایەمی بەردوارە لە سای دوو هۆکارا وە زنگی ماکەسەوە و سەرکەوتوون و زال بووگن: یەکەم ئەوەسا کە ئەمانەیلە نیتر بوونەوەرێلێکی وریا و وشیار بووگن کە ئەوزار و ئامێریان ساز دەکرد. دووەم لە سۆنگەی ئەوە کە ئەمانە هەر لە نواوە وە شێوەی دەسەجەمعی و لێل یەکا، وە کۆمەل - کۆمەل و بڕ - بڕ دەژیان.

بگرە سازدانی ئەوزار و ئامێر، ئەسلەن بێ ژیانی کۆمەلەکی و دەسەجەمعی هەر سەر ناگرێ و مەحالە، چون پاراستن و پێرست کردنی زانیارییەکانی مرۆڤ و کاری ئالوێر و بازرگانیی وی لە زەوینەی ڕەنێونانیندا و پشتاوپشت لە وەرینانەوە ئەڕای ئەوە و ئەوێران و ئەتیژەیل وە میراتی مانەوەیان، تەنیا و تەنیا هەر لەو هەلومەرجەدا ژ کرنێ دهات. نێچیرڤانیێ، ئەمازا نێچیرڤانییا جانەوەرانی گەپ و زەلام (لەهێندێ ناوچەی کوردستانی ئێرانێ واژەی «زەلام» بۆ چارێێ و بارگێن و چتی لەی جۆرە بابەتەیلە دەگوترێ) وە شێوەی دەسەجەمعی و دەسیاوی و

گەلەکۆمەکی ڕاوشکار ئەنجام دەدرا، ئیدی بەم جۆرە ئەوانەیان وە ئاییر دەتۆقان و وەپەڵ و خرک و کەور تێ سرەواندن بەرەو هەڵدێر و زۆنگ و زەلکاو و زەمەندیان هەڵ دەبڕین و تەنگاو دەکردن، سەروو و کەور دەکەم، بنوو خاک دەکەم بۆ کوێ دەڕۆن...

ئەی کۆمەڵە ئایەمییانە لە دەورانی کۆنە بەردینی دێریندا، بە نێوی ستانداردی گەلەوڕانە سەرەتاییەکانەوە نێو دەبرێن. ئەی گەلەوڕانەیلە ڕەنگە چکۆلە و تا ئەندازەیێ ناپایەدار بووبن. کەسانێ وان کاربوون بچنە ڕێزی گەلەیەکی دییەوە. گەل هەمیشە پێشەنگ و قەڵەوزێکی ڕێشاندەری، پیاو یا ژنی لە تەکا بوو، وێرای وەش دامەزرانی سازمانی جووتەکیی کەم و زۆر چەسپ و پایەداریش، کارێکی کردەنی نەبوو.

شڕوشکڵی ناقۆڵا و فاچەڵفیچی ئەوزارو ئامێری سەرەتایی کار پەست و نزمیی ئاستی ئابووری، ململانێی سامناک دەگەڵ خوڕسکدا، ئەمانەیلە سەرلەوەر گشتی لەناو گەلەی سەرەتاییدا حاڵەتی ئیندیویدوالیزمی دڕندە - Individualisme - یان کە مرۆڤی وەکەمەربووگ (فۆسیل) لە باپیرەگەورانی خۆەیان وەمیراتی بۆ مابووگەوە -دەپاراست. ئەو حاڵەتە ناو بەناو لێل وەیەکا دان و تێکچڕژیان و تێکیران و لێکدی هەڵکردن و لێکدی ڕۆهاتنی خۆنیینداو، کە دە هەلومەرجی ململانێ لەپێناوی ئەماندا، دەهاتە گۆڕێ بە دیاردەکەوت... بگرە مرۆڤی پیاوخۆریش هەبووگە.

بەرە - بەرە، کاتێ سازمانی کۆمەڵەکیی کۆمەڵە مرۆڤەکی دامەزریاو بنچەسپ و پایەدار و ڕوختە دەبێ و دەسرەنگینی و دەسوبرد و مەهارەتی مرۆڤ لە کاروباری بەرهەمهێناندا پەرەدەستێنێ و تەشەنە دەکا و دەتەنێتەوە، سریشتی ناژەڵانە دەداتە باری کزی و کەنەفتی. هەروەک فلادیمیر ئولیانۆف فەرموویە: گەلەی سەرەتایی و کۆمەڵی هاوبەشەکیی سەرەتایی سنوورێکی بۆ حاڵەتی دڕندایەتی (ئیندیویدیوالیزم)ی سەرەتاییی مرۆڤی سەرەتایی دانا.

باشە کەسی برای ئەدی بیر و ئەندێشە کوو پەیدا بوو؟ پەیدابوونی بیرو

ئەندێشە ئەنجامی چالاکی و ئەمسەرو ئەوسەر و هەڵپە و خۆوە داروبەرددا دانی ڕەنێوهێنانەی مرۆڤە. لە هەوارگەی گالۆک و داردەست، یا خرک و کەور وەکارهاوردنی ڕەمەکی و ئاژەڵەکی بۆ هەوارگەی ئەوزار و نامێر سازکردن - با ناقۆڵاو نارێکوپێکیش بووبن - چالاکیی وشیارانە و ئاگایانە و هەستوخوستی تیژی مرۆڤ وە دەنگ تێرێ. ئەزموونەکانی مرۆڤ لە کاروباری بەرهەمهێنیدا، نوخشەی تاقیکردنەوەی وی ساز دەدا و دە ویژدان و نیهادی ویدا ئاشکرا ڕەنگ دەداتەوە و شوێپ و شوێنەوار بەجێ دێڵێ.

لەوەڕا کە کار بە شێوەی دەستەجەمعی و دەستیاوی و گەلەکاری ئەنجام دەدرا و ئەزموون و تەجرەبەکانی دەستەی کۆمەڵ، پاسدارییان لێ دەکرد، کار و خەسڵەتی بیرکردنەوەی سەرەتاییی بەشەریش حاڵەتێکی کۆمەڵەکیی بەخۆوە گرت، واتە: کە کارکردن کۆمەڵەکی و گەلەکۆمەکی بێ، دیارە بیرکردنەوەش کە ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ، هەر بە دەوری کاردا دەخولێتەوە، حاڵەتی کۆمەڵەکیی بە خۆوە گرتووە، مرۆڤ لە چەرخ و چاخەکانی سەرەتاییدا خۆی لەکۆمەڵ بەجودا نەدەزانی. ئێستاش لە کۆمەڵی کودەواریی عەشیرەتیدا، کەسێکی نابینی پێناسەی هۆزو هۆزگەری و خزمایەتیی خۆی بە چتێکی پیرۆز نەزانێ، ئەوڕۆ هەر جافێک، هەر بڵباسێک، هەر مزووریەک، هەر بریفکانییەک، هەر سوورچییەک، هەر مەنتکێک، هەر مەغییەک، هەر براندۆستییەک، هەر زێبارییەک و تاد... دەگری، بەویەڕی شایی بەخۆبوونەوە شانازی بە عەشیرەتەکەیەوە دەکا، خۆی بە یەکێ لە عەشیرەتەکەی بەجودا نازانێ، نەک هەر ئەوەندە بگرە کە ڕەواندزییەک، هەولێرییەک، ئامێدییەک، سلێمانییەیەک، خانەقینییەک، بتلیسییەک و تاد.. دەڵێ: من ڕەواندزیم، یان هەولێریم یان فلانم یان فیسارم، ئەوەش هەر لە ڕەگ ئەستووریی ڕۆحی عەشیرەتگەرییەوە چەکەرەی کردگە. سەرلەبەری چالاکییە کۆمەڵەکییەکانی کۆمەڵی کوردەواری لە گوێن و پرسە و تازێمانە و شین و

شـايی و سـەیران و بنداروٚک و مـازی چنین و گـەلەدرەو و گـەلەجـووت و سەرلەبەری کارویاری هەرەوەزی و تاد.... کە زۆریان نەماون، پاشماوەی هەستی ڕۆحی کۆمەڵەکیە و خۆ بەبێ کۆمەڵ بەهیچ نەزانینە. بەڵێ ڕاستە ئەورۆ تاک دەوری زۆرە، بەڵام هەرگیز لەوەڵامدانەوەی ئەرێنیی پێداویستی کـۆمـەڵ دوا ناکـەوێ، ئەوەتا هەمـیـشـە هێـزو گـوردی دە پەنای خـێـزانە گەڕۆکەکەی، گوندەکەی، شارەکەی، هۆزەکەی، نەتەوەکەی، چ لە ڕووی ڕەگـەزەوە و چ لە ڕووی حـیـزبایەتی و سـیـاسـیـیـەوە دەبینێ، بەڵام دیموکراسییەتی گەرەکە، دەیەوێ وەک تاکیش ڕێزی لێ بگیرێ، نەک هەر ئەوە بگرە، دەیەوێ لە شێـوەی سـەرۆکێ، شـێـخێ، ئاغـایێ، مـەلایێ، زانایێ، شاعیرێ و سیاسیێ تاد... حیسابی لە کۆمەڵ پتریش بۆ بکرێ.

ئەوە بیرکردنەوە، ئەدی زمان کوو پەیدا بوو؟ زمانیش هەروەک ئەندێشەو بیـرکـردنەوە تەمـەنی درێژە و کـۆنە. ئەوانەی ڕامـانەی مـاتریالیـسم (ماددەگەرایی) یان داناوە، دەڵێن: «زمان بریتییە لە نیهاد و ویژدانێکی ئەزمـــوونکراو - Concienсepratique - کـە هەروەکـو لەبۆ سەرلەبەری مرۆڤان چێتێکی ڕاستەقانییە و هەس، لەبۆ زمانیش دەقاودەق هەس و ڕاستەقانییە، زمانیش وەکو نیهاد و ویژدان نائێتە گۆڕێ، مەگەر لە سۆنگەی ناتاجی هۆی ناچاربوونی دەگەڵ سەرلەبەری مرۆڤاندا تێکەڵ بوون...» یەکەم چەمکەکـانی هەمـوانی (کـلـي) هەکـە بە دەنگان نەچەسپـاندرابان، ئەوانە دە کـۆمـەڵدا هەرگـیـز پەیدا نەدەبوون، هەروەها ئەگەر زمـان نەبا هاوسـەروکـاریی تاکـان دە کـۆمـەڵدا لێل یەکـتـرا گـرتن و پێوەندی بە یەکدییەوە گرتن و کاری دەسەجەمعی و هەرەوەزی و دەسەوایی نەدەهاتنە گۆڕێ و لە بۆو چۆن و چەرا بەدەربوون. مرۆڤ هیچ جۆرە چەمک (مەفهووم)ێکی هەموانەکیی بێ تۆرێکی بەگرێ و گۆڵی هاوپێوەندی سەروساختەوار، بە تەنێ کەسێ، بەبێ کۆمەڵ، لە بیروبۆچوون نایە؛ چون مرۆڤ بۆ بە تەنێ ژیان لە مێژووی پەیدابوونیدا، نەهاتۆتە گۆڕێ و تاکە بوونەوەرێکی زیندوو بێ نێر و مێ هەرگیز بە بیردا نایە. جا کۆمەڵ لەو

نێرو مێیە کەوتوتەوەو دەکەوێتەوە. کۆمەڵ ژی یەعنی ژ نێکێ پێتر..

ڕامـــانەی مـــاڕ N. YAMAR، ڕامـانەیەکی هەڵە ئامـێـزە. لەمـەڕ لێکدانەوەی پەیدابوونی زمـان ئەو ڕامانەیە دێرزەمـانێ دووگـونەی بەسـەر زانسـتی زمـاندا لە ڕووسـیـا شـۆڕکردبۆوە، بگرە کـوردی بە گـورجی و نازانم کێی بە کارتۆفیلی و برێ لەم جۆرە مـنجرییـانەی وەبادەدا. ماڕ، وەتایبـەتی پای دانەگـرت و نیلکەم و بیلکەمی ئەکرد زوانی سـەرەتاییـانەی مرۆڤ لە (ئامـاژە و ئامـاژەکـاری)یەوە سـەری هەڵداگـە و زوان لە جـمـوجـوێلەوە کەفـتـگەسەوە. پێی وابوو، قسـەی دەنگدار لە فلـتـە فلت و منگە منگی کاهـینەکانەوە هاتۆتە گۆڕێ. ئەو دەی گۆ: زمان تا تها ژی مۆرک و شەقلی چینایەتیی سـەروبەندی چینـایەتیی: «ئەمـە ئاغـا و ئەوە مـیـرو ئەمەکـەیانە (کـوێخـا) و ئەوەکـەیانە گـزیر» وە زەق و زۆپی پێـوە دیارە، بەڵام ئەی ڕامانەی ئاخرزەمانەی ماڕنەفەندی، قوڕحان وە هەق و وە سـاحێوت حیـچی وەسەر حیچەوە نییە و لە هەرزە وەولاوە چتێکی تر نییـە...

ئێـمـە هیـچ بیـروبۆچوونێکی ڕوون و ئاشکرامـان لەمـەڕ سـاخـتـمـانی زوانەیلی بنـیـایەمی سـەرەتاییەوە نییـە. زانسـتـمـەندی شـۆڕەویی کۆن، و. بۆناک ناو، وای بۆ دەچێ کە ئەزموونی بەرهەمهێنان بەرە - بەرە - فراژوو و پروپوخـتـە و ڕێکوپێـک دەبێ و گـەروو لە سـای وە پاوە ڕاوەسـتـانی مەیموونەیلی مرۆڤ ناسایی و چکۆلەبوونەوەی شـەویلاگەی خوارێی، کامل دەبێ، هەنگێ زمان لە ئاماژە و دیاریدە دەنگدارەکانی ئەم مرۆڤانە پێک دێ. لەی زمانەیلەدا واژەکان تا ڕادەیێ بە کەوشەنن، یان وە وردتر بێژین، لە ڕستی یەک برگەیی، کەرت - کەرت و مانا جیاواز پێک دێن.

بەش وە حاڵی ئایین، زانـــــتـمـەندانی بۆرژووا لافی ئەوە لێ دەدەن، کـە مرۆڤ هەر لە سـەرەتای چاوپشـکووتوونیـەوە، بڕوای بە سـەرووی خۆڕسـک هەبووگـە و باریتـەعـالا - Etre Supromo - خوداوەندی پەرسـتووە. کەشیشـی فەرهەنگناسـی ئوتریشی بەناوی پ. و. شـمیت و پەیڕەوانی وی مەردم فێرە ڕامانەی یەکتاپەرسـتیی ئەزەلی - Primonotheisme -

دەکەن. ئەم ڕامانە مبارەکە یەژێ: مرۆڤ لە سەرەتای دروست بوونییەوە، بڕوای بە هەبوونی یەک خـوداوەند هەبووگـە و هەر ئەو بڕوایەیە کـە دە نیـهادو ویژدانی مرۆی سـەرەتاییـدا پەیدابووە، بۆ خـۆی نیشـانەیێکە لە بوونی خوداوەند، کەچی ئەم ڕامانەیە لەگەڵ وەی کە لە گۆڕانکارییەکانی ڕەوانی و ڕۆحیی مرۆڤەوە زانداراوە دووفاق و تاق و جووتن.

دە بارودۆخـێکدا کـە تاکـە مـرۆڤێ سـەرقـاڵی سـەروبەرنانی خـۆراکی ڕۆژانەی خۆی بووە و یەکەم بیروبۆچوونی وی لە کار بەولاوە سەروکاری بە هیچ چتێکی دیکەوە نەبووە، نەیدەکاری بیر لە شرۆڤەی جیهان بکاتەوە.

لەمـەش بترازێ، کـرچ و کـاڵیی تەواوی مێشکی وی دەرفـەتی ئەوەی نەداوە لەم جۆرە چەمکە ڕووت و پەتییانە بکاتن.. مرۆڤ لە بارەی خودی خـۆی و خـۆڕسکێ کـە دەوراندەوری تەنیـبـوو بیروباوەڕی ئایینی، واتە: بیروبڕوای تەمومژاوی و هەڵە و وڕێنە هەر نەش بووە. ئێمە دەتوانین لەسەر ئەوە پێ دابگرین کە مرۆڤی وەتەوەنبووگ (فۆسیل) هەر حیچ نەوێ بەش وە حاڵی مرۆڤ - مەیموون و مرۆڤی چین، کە هەر لە بنەڕەتدا فریان بەسەر بیر لە ئایین کردنەوە نەبووگە.

هەرچی ئەو قسـەیەشە، کە یەژێ مرۆڤی نییاندەرتاڵ چتێکی پەرستووە یا نە، خـۆ ئەوە کـێشـەیەکی وە گـرێ و گـۆڵـترە و ژمـارەیەکی فـرە لە زانسـتمەندان لەسـەر ئەمە تا ئها ژی مشتومڕ و گوێپچڕیانە. بەپێی نا. ئۆکلادنیکۆف گۆڕخانەیلێ کە لە دمادمای دەورانی کۆنە بەردینی دێرینەوە وەجێ مـاگن، گـەواهیی هەبوونی بیـروبۆچوونی سـەرەتایی لە نییاندەرتاڵەیل نەدەن، ئەم گـۆڕخانانە لە ناو شکفتەیلێکدا کە ڕۆژگارێ لانە و کاشانەی مرۆڤ بووگن هەڵدەکەنران و لەبۆ مردییان چاڵی چکۆلەیان هەڵدەقەناند و چەند گلـمتکە گۆشتێکیان لۆ تێدا دادەنا. نییاندەرتاڵان بە دیمەن پاسـەوانی و پارێزگـارییـان لە مـردووی خـۆ دەکـرد و لە گـوێن زیندییـانیان ڕفتـار دەگـەڵدا دەکردن، وەلێ هێـمـان بیروبۆچوونی جیـهـانی نەهاتبووە ناراوە. ئەوان لەبۆ مردیی، هاژ بڕوایان بە توانـسـتێکی سـەرووی

خۆرسک و له هێزێکی که له گوێن هێزەکانی سەر زەوین نەبێ نەدەکرد.
لەم چەرخ و چاخەدا یەکەم سریشتەکانی پەرستن، گیان لەبەرەکان – Zoolatric –ن، له چواردەوری گۆڕخانەی نییاندەرتاڵەکاندا، له تشیک تاش له باشووری ئوزبەکستان) شاخەیلی بزنەکێوی هەبوون و له هێندێ شکەفتاندا کاسەسەری ورچی شکەفتنشین دۆزراونەوە که چواردەوری وە کەمەر و بەرد هەڵچنرابوو. هەنگێن زانیاریی مە لەمەڕ چۆن پەیدابوونی فرە ئایینی کەم بووگە و ورد نییە... یەکەم نیشانە و شایەتی بێ چەند و چۆن له مشتومڕبەدەر تەنێ باس و خواسی پەیدابوونی ئایینه له چەرخ و چاخی پاشانەکێ، واتە له چەرخ و چاخی بەردینی دێریندا. لێرەدا بەش بە حاڵی کوردەواری، تا نهاڕێ زۆر له تەکیە و مزگەوت و خانەقا و جێی تایبەتی له کوردستاندا گۆڕستانی تایبەت بەرچاو دەکەون و کەسانی خانوادە و بنەماڵەی پیرانی تەریقەت و شێخ و مەلا و ئاغا و بەگ و گەورە پیاوان، لەو گۆڕستانە تایبەتانەدا دەنێژرێن..
ئەوجا پاش کۆنە بەردینی دێرین، کۆنە بەردینی نوێ دەست پێ دەکا (له ٤٠ هەزار ساڵەوە تا ١٢ ساڵ پێش له دایک بوونی عیسای مەسیح). بە درێژاییی ئەم سەوربەندە، هەلومەرجی هەرێمی، چەندین جار دەگۆڕێ، چاڵەبەفران هویر- هویر پاشەکشێ دەکەن و ئاووهەوای ئەوروپا و سیبیریای باشوور خۆش دەبێ، پاشان سەهۆڵبەندان سەرلەنوێ دەست پێ دەکاتەوە و ئەمە چارەمین و دواهەمین هێترشە، سەرەڕای وەی کە له سەریاکی سەهۆڵبەندانەکانی دیکە کزو بێ زەبروزەنگترە، ئاووهەوا زۆر ناهەموار دەکا. ماموتان دە گەرووی خامۆشیی هەتا هەتاییدا لوول دەدرێن، کەچی گاکێویان بە سەرانسەری گوێ دەریای ئاوین و کریمێ و قەفقازدا پەرت و بڵاو دەبنەوە.
پەڕینەوە بۆ دەورانی کۆنە بەردینی نوێ بە پێشکەوتنێکی بەرچاوی ساختمانی لەش و لاری مرۆڤ قەڵەمداد دەکرێ و دەگەڵ خەسڵەتی بەرهەمهێنان و پێشکەوتنی سازمانی کۆمەڵەکیدا بە دیاردەکەوێ.

ساختمانی مرۆڤی هاوچەرخ - Homo - Sapiens - دەگاتە ئەوپەڕی پێشکەوتن، هونەر و ئابووریی کۆمەڵی مرۆڤێن کامڵتر و بەگڕێ و گۆڵتر دەبن و نەخوازا ئەوزارەیلی تایبەت کە بۆ سازدانی ئەوزارەیلی تر وەکار دەهێندرێن و ئامێرو ئەوزارەیلێ کە لە دارو سوقان یا لە دار و بەردەستێ دروست کراون لەم سەردەمەدا پەیدا دەبن. مرۆڤ شکەوتان بەجێ دێڵن و دەست دەدەنە سازدانی پەناو پەسێوی گەرموگوڕ، شێوەی نوێیاوی سازمانی کۆمەڵەکی - کۆمەڵی خێڵەکیی سەرەتایی - Clan Primirf - دێنە گۆڕێ، پاشانەکێ هونەر پێ داوێتە گۆڕەپانی پەیدابوونێ. بە ڕاستی هەروەک زانستمەندان دەڵێن، بۆ دەورانی کۆنە بەردینی نوێ پەڕینەوە، وا‌تە. مرۆڤی نیاندەرتاڵ کە بە مرۆڤی ئەوڕۆکە بوون، بە ئەکانێکی چۆنەکی و بنواشەکیی تایبەت لە قەڵەم دەدرێ.

لەم سەروبەندەدا تەکنیک بە چەند پلە لە ئی بەرێ، پێشڤەتر چوویە، ئەڤزار و ئامێرێن ژ کەڤر دروست کری کامڵ دبن، مرۆڤ زوێڵە بەردستیی تەنک و ئاسک بەهۆی ئامێری هێسکانی دادەتاشێ. لە دماترین ڕۆژگارانی سەروبەندی کۆنە بەرینی نوێدا کاروبار ئیتر هەر وە بەرد و کەورەوە قەتیس نامێنێ و یەکی لەسەریان ناکەوێ، بگرە هەستی و شاخیش بەکاردەهێنرێن..

ئەڤزار و ئامێرەیلێ کە بۆ خۆراک تەیار کردن وەکارتێن، جۆراوجۆرترن. نێزەی لە نووکە شفرەی عاجی ماموت، لە بەردەستێن، خەنجەری لە شاخ دروس کراو، نێزە بۆ ڕاوشکار و ماسیگری، ئەوزارەیلێ بۆ پۆست کەندن و کەوڵ کردنی جانەوەران بەکارهاوەردن، دێنە گۆڕێ. لە سووژن و گۆشەوەنی سوقان بۆ دروونی پۆشاکی کەوڵ و کوڕک و لە پاژە بەردستیی تیژ بۆ پەرداخ و لیکولووس و مشتومال کردنی شاخ و سوقان، سوود وەردەگیرێ. ڕاوشکاری گیان لەبەری زەلام و گەورەو زەبەلاح کە لە شێوەی گەلەوران دەچێرن داوێنەیەکی بێ پێشینە بەخۆوە دەبینێ. لە بیرکدمۆستێ لە چیکۆسلۆڤاکی کۆمەڵە هێسکی هەزاران ماموت

دۆزرایەوە. لە دمادمای ئەم سەروبەندەدا ڕاوەماسیش بە فرەوانی پەرە دەستێنێ. ئەم پێشکەوتنە لە کاری بەرهەمهێناندا دەرفەت و هەل بۆ مرۆڤ فەراهەم دەکا کە شێوەی ژیان و هەوارگرتنی یەکجێ نشینی - Sa- dentaire - بگرێتە بەر.

مرۆڤ هەواری خۆی لە پەناگای دەستکرد، سەیوانان، کولیە و کۆلیتان، زنج و کۆڕان دەست پێ دەکا. لە کوردستان لە شکەفتی شانیدەرو هەزارمێرد و شوێنانی دی ئاسەواری زۆر لە نیاندەرتالان و خانووبەرە و تشتی لەم جۆرە بابەتێلە بەرچاو دەکەون.

ڕووسیا (سۆڤیەتی بەرێ) ئاسەواری چەرخ و چاخەکانی کۆنە بەردینی نوێ لە پشت قەفقاز، کریمێ لە گۆلاوەکانی دنێپەر و دۆن، بە درێژاییی چوسووابا و لە سیبیریا دۆزراونەوە. هۆز و خێڵەساتی کە دوور لە ناوچەکانی چاڵەبەفران دەژیان، بە شەقڵ و مۆرکی تایبەتی خۆیان لە ئی دیکە جوێ بوونەوە. لەو سەروبەندەدا لە ئەفریقای باکوور شارستانیەتێ کە پاشانەکێ بەنێوی کاپسا (قفضا، ئەمڕۆ لە توونسە) نێوی دەرکرد، بە ورشە و ڕەونەق دەکەوت. خەڵکی کاپسا، بە پێچەوانەی ڕاوچی و ماسیگرانی باشوور بە زۆری، ژیانیان بە گردوکۆی میوە و سەوزی و لەوان بابەتان بەسەر دەبرد. ئەوان لە هەڵ کردنە سەر دڕندەیلێ لە گوێن شێر و پڵنگ سامیان ڕێ دەنیشتێ، وەلێ بەڕێوەچوونی وان بە شێوەی سەرەکی وە گردۆکوێ وردە ئەرم تەنەیلی خۆراکی، کیسەڵەیل، هێلکەی وشترمر و لەی جۆرە بابەتەیلە، سەروبەر ئەنریا، لەی ڕۆژگارەیلە لە خاوەری زرێی سپی، کریمێ و پشت قەفقاز، کە شارستانییەکی وەک شارستانییەتی کاپسا لەوراکە چەوی پڕیاوی حاڵوبارێکی ئابووریی هاوشێوە هەبوو.

باشە، ئەی کۆمەڵی تیرەگەری چۆن - چۆنی چاوی پشکوتوو؟ بێ گومان، گەشەکردنی هێدییانەی لەسەرەخۆی هێزەکانی بەرهەمهێنان و بەرەو ژیانی یەکجێ نشینی پەرینەوە، ژیان و گوزەرانی بە کۆمەڵ و دەستەجەمعیی مرۆڤی بنچەسپ و ڕوختە کرد و لە ئەنجامدا حاڵەتی

«ئیندیڤیدوالیسمی دڕندان» لەنێو چوو. گەلەی سەرەتایی جێگای خۆی لەبۆ سازمان و دامەزراوێکی کۆمەڵەکیی هەورازتر و باڵاتر و پێشکەفتیتر چۆڵ کرد. ساختمانی گەلە بە شێوەیەکی سەرەکی لە سێ لاوە بەرەو کامڵ بوون دەڕوا: یەکەم ئەوەیە کە زێدەبوونی دەسکەوتی بەشێکی کار وا لە مرۆڤان دەکا کە لە دەستەو گرۆی کەم خەڵکتردا، کە لەگەلەی سەرەتایی جوێ ببوونەوە، وەلێ هاوپێوەندیی ئابووریی خۆیان هاژ هەر دەگەڵ واندا پاراستبوو، خڕ دەبوونەوە. ئەم دەستە و گرۆیانە خۆیان بە خزم و کەسی یەکدی دەخوێندەوە و لەوانەش بوو، لەسەر یەکدیشیان کردبایەوە و بگرە ناو بەناو یەکدیشیان بۆ ناوچە و قەڵەمڕەوی ڕاووشکاری خۆش، گاس دەکرد. دووەم ئەوەیە کە مرۆڤگەلی سەرەتایی بە پلە و پایەیێ دەگەیەن کە لە هاوسەرو ساختیی ژن و مێردایەتی لە چارچێوەی دەستەو گرۆدا بەرەوبڕی بکەن. ئەم کارە کە بە لە هاوسەری بەدەر (ئێگزۆگامی - Ex-ogamie) نێو دەبرێ لێل گەشەکردنی ئابووریی مرۆڤەیلدا هاوسەروکارە. ژن و مێردایەتی ئیدی کارێکی ژیانی نییە، بەڵکە دیاریدەیەکی کۆمەڵەکییە کە بە هۆی کۆمەڵەوە ڕەوایەتی (شەرعییەت)ی دەدرێتێ، واتە: جووت بوونی ژن و پیاوێ تەنیا بۆ پاراستنی ڕەگەز و جۆر نییە و کاری تاک نییە، بەڵکو کۆمەڵە و کۆمەڵ شەقڵ و مۆرکی خۆی پێوە دەنێ.

هاوسەربەدەری تەنیا لە قۆناخێکی دیاریی کۆمەڵدا دەتوانێ بێتە گۆڕێ: چونکە گەلەی سەرەتایی یەکانەیەکی کۆمەڵەکیی سنووردار بوو و دەگەڵ کۆمەڵانی دیکەدا هاوسەروکارییەکی ئەوتۆی نەبوو؛ تەنیا پاش ئەوەی دەستە و گرۆیەکانی دایک و فرزەندی یەکدییان بەخزم ناسی و ئەندامانی ئەم گرۆیانە لە سای لێل یەکترا ژن و ژنخوازییان درێژە پێ دا، داسەکێن و چەسپانی هاوسەربەدەری لێرەڕا ئەوجا سەری گرت و بوو بە چتێکی کردەنی و خوازراوی.. ئەی کارە لە هەمان حاڵدا کە مانایەکی فەلسەفییانەی هەس- فەلسەفەی هاوسەریی لە چارچێوەی دەستەیەکی کۆمەڵەکی (گرۆ)دا- ئەسڵێکی ئەرێنی (ئیجابی)یشی وە بەردوە هەس و

ئەوەش ئەوەیە کە ژن مارەبڕین لە دەستەیەکی دیکە، دەستەیەکی دەستنیشان کری دەبێ بەکارێکی ناچاری، واتە: ئیدی ناتوانێ سەرپێچی و کەڵەوەکێشیی لێ بکا، ئیتر لەمە وەپاش دوو دەستەی خزم و خوێش بەڕێوەرەسمی دوولایەنە پێوەندی دەگەڵ یەکدیدا دەگرن و دەبن بە هاوسەروکاری یەکدی: لە سەرێکەوە ژن هێنان لە چارچێوەی یەک دەستەدا پاوان و قەدەغان بوو و لە سەرێکی دیەوە کەسانی دەستەکە تەنیا دەگەڵ ئەندامانی دەستەی خزمدا دەیانتوانی ژن بێنن. ڕێوەرەسمی ژن هێنانیش دە چارچێوەی کۆمەڵێکی گەورەدا، بە ژن و مێردایەتی - Endogamie - ناودەبرێ و هۆزی ژن و مێردایەتی کە لە دوو کۆمەڵی هاوبەش - -Com munatte - خزمی یەکدین، هاوکات لەگەڵ پێکهاتنی کۆمەڵی خێڵەکیی ناژن و مێردایەتیدا دێتە گۆڕێ. ئێنگاس ئەم سازمانە دووینەیەی بە شێوەی سەرەتاییی کۆمەڵی ناژن و مێردایەتیی بنەماهۆز داوەتە قەڵەم. پاشماوەکانی ئەم سازمانە دووینانە، دە ئاستێکی گەشەکردوو و پێشکەوتووتردا، تا ئەورۆش هەر ماون. کەلەپوورناسان پاشماوەکانی ئەم سازمانە کۆمەڵەکییانەیان لە ناو تورکمانەکان، ئەڤێنەکان، قرغزەکان قەرەقاڵپاخەکاندا بەرچاوکەوتوون. ژمارەی دەستەی ناژن و مێردایەتی لە چارچێوەی یەک هۆزدا لە شێوەی دەستە - دەستە - Maringe pur groupe -دا بوو. واتە: سەرلەبەری ژنانی کۆمەڵی هاوبەشەکی هاوسەری ڕاستەقینەی بیلقووە (Potential)ی پیاوانی کۆمەڵی هاوبەشەکیی دیکەمان هۆزن. (بەداخەوە تا ئێستاش ئەم دوو زاراوەیە «بالقوة و بالفعل» بە زمانی کوردی نیمانە. کەچی لە زۆر ڕستەی زانستەکاندا بەکار دەبرێن..

وێڕای وەی کە جەمسەربوونی گرژ بە پێکهاتنی بە ڕێکەوتی جفتەیلی کەم تا زۆر چەسپ و پایەداری، فت نەدەکرد، وەلێ سەرەڕای ئەوەش هەموو، هیچ کەس بەش بە حاڵی هاوسەری خۆی خاوەن مافی پاوانکراو نەبوو.

پاشماوەکانی جەمـەربوونی گرۆیانە، بەنموونە لەکن ئوسترالیاییەکان کە هۆزەکـانیـان بە دوو یا (چار) گـرۆ کە بەشێوەی هاوجەمـەریی بەرابەر، تێک بەسترابنە، تا هەنووکەش پارێزراینە و بووینە کەرەستەی لێوەکۆڵ و لێوەتوژانی ڕەگەزناس (ئێتنۆگراف)ان. ڕووسیـای دوادوای سـەدەی نۆزدەهەمدا لە شتێرنبـەرگ، بابەتێکی لەم جۆرەی لەناو نیـوخەکـان (گلیـاک)ەکـاندا دیتـووە. ئەم پیـاوە حوکـومـەتی قـەیـسـەری، لەسـەر چالاکییەکانی لەناو ڕیزی «نارۆدنایاولیا - Narodnaia Volia -دا بۆ ڕۆژهەلاتی دووری ڕەهەنە کردبوو.

سێیەم ئەوەیە کە ساختمانی گەلەی سەرەتایی لە ئەنجامی کامڵ بوونی دابەش کردنی خۆڕسکانەی کاردا، شێوەیەکی بەگرێ و گۆڵ پەیدا دەکا. وێدەچێ، دابەش کردنی کار بەپێی تەمەن هەر لە هەمان سەرەتای هاتنە گۆڕێی کۆمەڵی مرۆڤەوە سەری هەڵ دابێ. بەلام لەو زەمانەدا پیاو و ژن لە ئابووریدا دەورێکی چونیەکیان دەگێڕا. تەنیا لە ئاخرو ئۆخری دەورانی کۆنە بەردینی دێریندا، کە دابەش کردنی کار لەنێوان ژن و پیاودا دێتە گۆڕێ: پیـاوان بە ڕاووشکارەوە خەریک دەبن و ژنان و دۆمـۆنی (منداڵ) بەسـەر میوە خڕکردنەوە و گیاوگۆڵ کۆکردنەوەدا ڕادەگەیەن. دێرینە ناس پ. ئەفی مەنکۆ، وای بۆ دەچێ کە ئەوزار و ئامێری نیـاندەرتالان سەر بە هەردوو ڕەگەز - ژن و پیـاو - بووگن. پاژە ئەوزارەیلی نووک تیژ، کێردی پیاوان بوو و هەرچی ژنان بوون پێناوەیلی شـەک ڕووشـێن و داروبەردتاش - Radoir - یان بەکـار دێنا. کـاردابەش کـردن بەپێی تەمـەن و ڕەگـەز، نەتەوەکـانی هەریەکـە لە تەرحێ و هەریەکـە لە ڕەنگێ کـەلەپوورنـاسـانی وەسـەر کـەڵکەڵەی لێوەکۆڵین و وردکـردنەوە ئێخـسـتـییە. وە نموونە: لە نوسـترالیـا ژن و دۆمۆنی، مـاسـیـیـان دەگرت و خێروبێر و بەخششـتی خۆڕسکیـان گرداری دەکـرد و پیـاوان بە ڕاووشکارەوە سـەر گـەرم بووگن. ئیدی بەم ئاوایە کاردابەشکردن لە نێوان پیاوانی هۆزدا جۆرە جیاوازییەکی لێ دەکـەوێتـەوە: پیـاوان بە جیـا لە ژنان خـانووبەرە لەبۆ خۆ هەڵدەبژێرن،

ژنان جۆرە خۆراکێکی جوداواز و پیاوان تەرحێکی دی بۆ خۆ تەیاردەکەن و زمانی ئاخاوتن لەنێوان ژن و پیاودا بەرەو فەرق و سوو دەڕوا. فەرقی نێرو مێ لە ئەغلەبەی زمانانی نەتەوەکاندا پەیدا دەبێ، تەنانەت ئەدەبیاتی ژنان کە تا ئەوڕۆکەش لەنێواندایە و هەیە، هەر پاشماوەی ئەم لێک جوداوازییە لە مێژینەیەیە.. پۆشاکی ژن، لە زۆر سەرەوە لە نێ پیاو جوێ دەبێتەوە، تەرزی ڕەفتار و کردار و هەڵسوکەوت و.. تاد. هەموو تاڕادەیەکی بەرچاو دەگۆڕێن. ئەدەبیاتی ژنان، ڕەنگی پۆشاکی ژنان، تەرزی ئاخاوتنیان، لەنجەولاریان، جۆری پیاو لە خشتەبردن و مەکرۆیی و دەهۆ و پیلانیان لە نێ پیاوان جوێ دەبێتەوە، ئارایشتیان، خۆ دە بەزەک و دۆزەک دانیان، وەک نێ پیاوان نابن... تا ئەوڕۆش تەرزی ڕەفتار و کرداری پیاو و ژن جداوازن و تا دێ لێکدی دوورتر دەکەنەوە. ئەمەش لە یەکەم کار دابەشبوونەوە ناو دەخواتەوە. ئەم کاردابەشبوونە لە بنەڕەتدا دەبێتە هۆی ئەوە کە برێ ڕدێن سپیی بە ساڵداچوو کە بە دەم ڕۆژگارەوە ئەزموون و مەهارەتێکی کۆمەڵەکییان دەردەست کردووە، پلەو پایەیان لە سەرووی هەموانەوە بێ و ببن بە دەمڕاست و قسەڕەوای هۆز و جڵەوی سەرلەبەری کاروباری کۆمەڵی هاوبەشەکی وەدەستەوە بگرن و ببن بە پێشەوای کۆمەڵ و وەو سانە لە بەرایی دەورانی کۆنە بەردینی نوێوە، کۆمەڵی مرۆڤەکی مالاوایی لە ساختمانی گەلەی سەرەتایی دەکا و ئەو جۆرە سازمانە بەجێ دێڵێ: بەرە - بەرە کە هێزەکانی بەرهەمهێن و کاردابەشبوون فراژوو دەبێ و وەگەشەکردن ئەکەفێ و کامڵ دەبێ، گەلەکە جێی خۆی بۆ سازمانێکی کۆمەڵەکیی بالاتر - شێوەی سەرەتایی هاوبەشەکیی خێڵەکی - بە جێ دێڵێ، دیارە مرۆڤ کە بەم هەموو گۆڕانکاری و هەوارو قۆناخگۆڕییەکییەدا تێدەپەڕێ و سەربەنی یەکەم گۆڕانی کۆمەڵی لە دابەش کردنی کاردا وەدەس ئەکەفێ و ڕەگەز و تەمەن و ئەزموون و فەرق و سووی وەدەس هاوردن... تاد فەرق دەکەن. ئاشێ لەش و لار (تیپی بیۆلۆژی)ی هەروەک خۆی بمێنێتەوە. مرۆڤ لەش و لاریشی

هاتنه گۆڕێ و به ساردبوونه‌وه‌ی هه‌ڵمان ئوقیانووسه‌كان و ڕووبار و ڕۆخانه‌و جۆگه و جۆباران په‌یدا بوون.

له ژێ، نیشانه و ئاسه‌وار مانا چییه، نه‌بوو، دوور نییه ده باروده‌خێكی تایه‌ندا گه‌شه‌كردنی ئاوێته‌كانی كاربۆن، به‌ره‌و په‌یدابوونی ئه‌سیده‌كانی ئه‌مینیدای ڕاكێشابن و بووبن به پرۆتین و پێویستییه‌كانی داهێنانی مایه‌ی ژیی له‌سه‌ر زه‌وین دابین كردبێ. له‌وه ده‌چێ كه یه‌كه‌م بوونه‌وه‌رانی زیندوو له جۆره ڤایرۆسه‌یلێ په‌یدا بووبن كه له ناو ناو و بێ ئۆكسژین سه‌ربه‌خۆ ژیابن. ئه‌م بوونه‌وه‌رانه وه‌ك ئه‌و گیاوگۆلانه‌ی كه نه‌ك ته‌نێ بێ ئۆكسژین ده‌ژین، بگره تێراویشیان ده‌كه‌ن، ده‌چن. هه‌ر ئه‌م بوونه‌وه‌رانه بوون كه هه‌لومه‌رجی ده‌وروبه‌ری له‌بار و گونجاویان بۆ كامڵ بوون و گه‌شه‌كردنی پاشانه‌كێی ژیی گیاوگۆلان و گیانله‌به‌ران له‌سه‌ر زه‌وین ته‌یار و ئاماده‌كرد.

هه‌لومه‌رجی ئاووهه‌وا و جوغرافیاییی زه‌وین، په‌یده‌ریه‌ی ده‌گۆڕا و كامڵبوونی بوونه‌وه‌رانی زیندوو، درێژه‌ی ده‌داین و پێشڤه‌ده‌چوو، تا سه‌رهنجام مه‌مكداران په‌یدا بوون.

له دوای سه‌روبه‌ندی سێیه‌می زه‌وینناسی و سه‌ره‌تای سه‌روبه‌ندی چاره‌م (نزیكه‌ی پێش یه‌ك ملیۆن سال) یه‌كه‌م مه‌یوونه‌یلی مرۆڤ ئاسایی، كه ده‌توانین به باپیره گه‌ورانی مرۆڤیان له قه‌ڵه‌م بده‌ین، هه‌بوون. به كورتی، مرۆڤ به كاوه خۆ، پاش چه‌ندین گۆڕانكاریی بایۆلۆجییانه، كامڵ بوو و شۆپ و شوێنه‌واری خۆی به دیار نێخست و پێ به پێی پێشڤه‌چوونی زه‌مان، ئه‌م شۆپ و شوێنه‌وار به دیار نێخستنه پێتر ده‌بوو. ئه‌مه‌ش (۹۰۰.۰۰۰) سالی درێژه كێشا، تا مرۆڤ كاری یه‌ك ده‌وره‌ی ململانێ و پێشڤه‌چوون و كامڵبوونی به ئاكام گه‌یاند و ئه‌وجا به‌م لووس و پووسی و تیفتیفه‌كراوی و په‌رداختكراوییه، بوو به‌م كوره‌ی نیرۆ: مرۆش ئه‌ندیشمه‌نده و - ,Hommo Sapiens به‌م داڕشته و قه‌لافه‌ته‌ی ئه‌مرۆوه‌ی پێ هاویشته دنیای بوونه‌وه.

دیاره پێش مێژوو، لەو ترووکەیەوە کە مرۆڤ لە قەڵەمڕەوی ئاژەڵ جوێ بۆتەوە، دەست پێ دەکا. نێوەرۆکی ئەم جوێبوونەوەیە مانای ئەوەیە کە مرۆڤ بەسەر چەندین لەمپەر و کۆسپ و هەڵەمووتاندا، کە جارێکی دیکەی لە ژیانی کۆمەڵەکیدا، بۆ دوارۆژ، هەرگیز ڕووبەڕوو نابێتەوە، زاڵ بووە.

ژیانی مێژوویینە لەو سەروبەندەڕا کە نوخشەی دەوڵەتان لە ناوچەی کەنارای - دۆڵی نیل و ناوچەی دیجلە و فوراتدا بە دیار دەکەون، سەری هەڵ داوە. ئەمانەش، وێدەچی چوار هەزارساڵ لەمەوبەر پەیدابووبن.

مێژوو بە زۆر مانا و چەمک، دەربڕین و لێکدانەوەی بە خۆوە دیتووە. لە سەروبەندی چاخەکانی ناوینداا بە شێوەیەکی ناماقووڵ و خەیاڵپڵاوانە دەناسـاندرا. لە سـەردەمی بووژاندنەوە (ڕێنەسانس)دا یەکەمین سریشتەکانی بە دیار ئێخستنی قووڵی ڕووداوەکانی مێژوو - سەرچاوەکانی مێژوو بەر ڕەخنە و توانج و تاوتووکردن دان - بە دیار کەوت و لە ناسەواری مێژوونووسانی سەدەی (١٨)دا هەولودەول و ڕەنجێکی زۆری بۆ دراوە و ڕووداوەکانی ڕابردووی کۆمەڵی مرۆڤیان بە فەلسەفەیەکی ناقڵانە (ڕاسیۆنالیستی) تێدا لێک دراوەتەوە. ئەم سەروبەندە لە ڕووی دیرۆک حاڵی بوونەوە، ڕاستیت گەرەکە، دەورێکی لە قۆناخێکەوە بۆ قۆناخێکی دیکە پەڕینەوە ڕەفتەنییە، واتە: سەردەمی لێکدانەوەی مانای مێژوو لەسەر بنچینەی «خوایشتی خوداوەند» جێگای خۆی بۆ سەردەمێ بە جێ دێڵێ کە ڕووداوەکانی کۆمەڵی مرۆڤ لەوێدا، لەسەر پایەی چالاکی و هەڵپەی تاکەکەسانی بەرچاو و هەر خۆی حسێو، لێک دراوەتەوە.

لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمرا، دەورانی ئەو ڕۆژگارە لە ڕووی نابووری - کۆمەڵەکییەوە بە دەورانی پێشکەچوون و گەشەکردن و تەشەنەکردن و تەنینەوەی سەرمایەداری دەژمێردرا، زانستی مێژوو کامڵ بوو و دیرۆکنووسانێکی زۆر کاری کامڵ بوونی کۆمەڵی مرۆڤیان لەسەر بنەمای یاساوڕێسای کەوشەن و سەرحەد و سنووردیار، لێک دەدایەوە.

وەلێ بە تێکڕایی لە مێژوو حاڵی بوونی ئەم سەردەمەش، هەمدیس هەر لەسەر بنەمای ماکی چەمکی «کاریگەریی تاکەکەس» ڕیشاژۆ بووە و هەر وەو سەنگ و تەرازووەی ئەو کە: گۆیا مێژوو «قارەمانان» دەیگووڕێن و تەنها، مێژووی قارەمان و کەڵەمێردانە و ئەودواکەی سەرلەبەر، هۆکار و پێناوی جموجووڵی ڕەوڕەوەی مێژووە و لە کۆمەڵە ئەوزار و ئەسپاوی وەولاوە چیتر نییە و بەس.

وێڕای وەش هەموو، مێژوو، هاژ نەبیوو بە زانستێکی ڕاستەقانی. یاساوڕێساگەلێ کە دیرۆکنووسانی بۆرجوازی دەیانویست ڕووداوەکانیان پێ شی بکەنەوە، بە هیچ ئاوایەک یارمەتی و کۆمەکی شیکردنەوەیەکی ڕاستەقانی و لەگشت سەرەوەی ڕووداو و هۆکار و سەوەوکارەیلی گۆڕانکارییەکانی کۆمەڵیان نەدەدا.

لە نیوەی دووەمی سەدەی (١٩)دا لە زەوینەی دیرۆکدا، ڕامانەگەلی نرت و نوێباو هاتنە ئاراوە. ئیدی مێژوو پێ داوێتە وارێکی نوێوە و دەبێ بە زانستێکی ڕاستەقینە و واقیعییانە. لەم سەروبەندەدا تەنیا ئانینەئاراوەی مەسەلەی سۆسیالیزمی زانستییانە و بابەتی چینەکانی ناو کۆمەڵ بوو کە بە لای خستنەگۆڕێی ڕامانەگەلی نوێباوەوە لە زەوینەی مێژوودا، شکایەوە.

ڕامانە نوێباوەکان و مەسەلەکانی دیرۆک لە هەموو سەرێکەوە و فرە وە داوێنشۆڕی و بە سەنگوتەرازوویەکی جیهانییەوە وەبەر شیکردنەوە دەدرێن و هەڵ دسەنگێندرێن و تاوتوودەکرێن. ئاتەواوی و کەموکووڕیگەلێ کە لە زانستی بۆرجوازییانەی مێژوودا عەمارەپوو ببوون و بڕستیان لێ برابوو، لە نێو دەچن.

مێژوو دە شێوازی جۆرە زانستێکی ئەوتۆدا کە ئیدی دەتوانێ ڕیشاڵەکانی ئەسڵیی ڕووداوەکانی مێژوو و گۆڕانکارییەکانی ناو کۆمەڵ بە ڕوونی نیشان بدا و کاریگەریی چینەکانی ناو کۆمەڵ زەق کاتەوە و کاری گەشەکردن لە هەموو سەرێکەوە، ڕوون کاتەوە و شارێی پێشکەوتن

و کامڵ بوونی پاشێ وەکا و خۆش و هەموار کا، چاوی دەپشکوێ.
جەماوەر زۆریان کەیف بە مێژوو دێ، زێتر ڕابردووی خۆیانیانی تێدا دەبینن و پتر ڕێی دوارۆژی خۆیانیانی تێدا بەدی دەکەن. جا هەر لە سۆنگەی ئەوە بووە کە چینی فەرمانڕەوا، لاگوێلی لاسایی کەرەوەی خۆیانیان وەکار خستوون و لەم شەوق و واز و سۆ و ناڵهایانەیان فرە وە نەگریسی و چەپخوونانە و نامەردانە سوود و بەهرەی خراویان لێ وە دەست هاوردووە و وە ناو «مێژوو»وەوە ڕێشمەی دووباد و سێبادیان بۆ لغاو کردنی مێشک و دەست بەستنەوەیان وە گورزەهۆن و پەلکەهۆن بۆ ڕێساون و بە بەزەک و دۆزەکی ساویلکە فریوانە ئارایشت و پەرداخ و تیفتیفەیان داگە...

ئاشکرایە، لە دوولۆی ئەم نووسینە ساویلکەخاپێنانە و بە زۆر بە ناو مێژووەوە سەپێندراوانەوەدا، نەک تەنیا هیچ خەبەرێ لەمەڕ سەرەوەدەری زانستانە لە مێژوو حاڵی بوون سۆسەی سۆسەناسایی ناکرێ، بگرە مەبەستەکانی بە جۆرێ دیزەوەدەرخۆنە کراون و پەردەی چەواشەکاریان بەسەردا دراونەوە، کە لە پەسنوێژی و بە شان و باهوو هەڵدان و مەدیحەسەرایی زیندە و بێتام و ستایشتی کاروکردەوەی زۆرداران و بە هەموو جۆرێ بۆ بە ناووبانگ جاڕدان و نامێ کردنیان سەرپێوە نەبوون و تەوهێن و سەرکۆنەی جەماوەر و دەوری لێ کەم کردنەوەیان و ناوەژوو و هەڵگێڕانەوەی ڕاستییان، هیچ چتێکی دیکەیان تێدا بەدی ناکرێ.
لەم «مێژوو»انە، لە هەموو چەرخ و چاخەکاندا، تەنیا بۆ پایەدارکردنی دەسەڵاتی چینی فەرمانڕەوا و سەرکوت کردنی خەبات و تێکۆشانی جەماوەر و بەرەوبڕی لە پێگەیشتن و کامڵبوون و پێشکەوتن و ڕێگا لێ بەستنەوە بەولاوە هیچ سوودێکی دیکە وەگیرنەکەوتووە. ئەدی نابینی فاشیزمیش (کە لە چینی بۆرجوای چکۆلەڕا سەری هەڵداوە) لە ستایشت و بەشان و باهووی «نەژادی لەبەرتر» و ئافەرین لە زۆرداری و هەڵایساندنی ئاوری شەڕ و کوشتاری بەکۆمەڵ، هەر بەو جۆرە «مێژوو»انەو

«قارەمان» پەرستی و خەیاڵپڵاوانەوە خەون دەبینن و پشت دەبەستن؟!
تەنانەت لەم کەش و هەوایەدا زۆر جار کار بەلای قارەمان بە خودازانیندا شکاوەتەوە و وشاری چینی فەرمانڕەوای کەڵەگا و دیکتاتۆر هەر بۆ خۆی زەوینە بۆ قارەمان بە خودازانین و ڕزگارکەر (کارزما) خۆش دەکا. دیارە ئەمە دوو لایەنی، ئەرێنی و نەرێنیی هەیە: چینی فەرمانڕەوا بە هەموو جۆرێ بەشی خۆی، چ بە قایلکردن و چ بە زۆرەملێ، لایەنگری زۆروزەوەندە لە هەموو چین و توێژاڵەکانی کۆمەڵ دەستەبەر دەکا: لە چەکدار، لە دوعاگۆ، لە سیخوڕ، لە ڕاپۆرتنووس و ماستاوساردکەرەوە، لە کۆلکە خوێندەوار و زوڕناژەنی پشتماڵە و پێشماڵە و تاد... وە نموونە: دڕندەیەکی وەک هیتلەر، مۆسۆلینی، ستالین، فرانکۆ، مستەفا کەمالی دژمنی نەتەوەی کورد، ڕەزا شا، عیدی ئەمین، مۆبۆتۆ، سەددام حوسەین، ئەمانە سەرلەبەر بەروبووی ئامبارەکی ڕژێمێکن کە بیرمەندانی بۆرجوا و وردە بۆرجوا، بۆ پاراستنی بەرژەوەندەکانی خۆیان، هەزار و یەک پاساوی خەیاڵچن و چاوچنۆکی هەڵبەست و ورێنەی میتافیزیکیانەیان بۆ دێننەوەو دەیکەن بە ئایەتی (نامەخوا) ئایدیۆلۆجیای وشکەسۆفیانەی پیرۆز... ئەمە لایەنی ئەرێنی بۆ بەرژەوەندی حوکمڕانی کەڵەگا و دیکتاتۆر، کە بەش بە حاڵی جەماوەر دیارە کارێکی نەرێنییە. نەرێنیی کار لەوەدایە کە فەلسەفەی ڕژێمی بەزۆرەملێ و فرتوفێڵ داسەپاو و دووگونەشۆڕ، بە هەموو شێوەیەک جەماوەر بەرەو نەزانی و چەواشەکاری و گومڕایی و لە واقیع دوورخستنەوە هان دەدا، نەزانی و سەرکوێرکردن، هەمیشە جەماوەر سست و گۆج و بێ دەسەڵات دەکا و بەرەو نائومێدی و تاریکی و پشت بە پێوار بەستن ڕادەدا. لە جیاتیی ئەوەی هۆی بێچارەیی و دەستەپاچەیی و کوێرەواری و کوڵەواری و بێ دەسەڵاتییان لە وشیاربوونەوەدا بدۆزنەوە، ڕووی ئاوەزیان، مێشکیان بەرەو فەنتازیا و ناواقیعییانە و خەیاڵپڵاوانە و چت بەزۆر بە ملێ خەڵک دادان و لەم جۆرە بابەتانە دەدەن. بزاوتە سیاسییەکان بە زۆری پەردەیەکی ئەفسووناوی بە

دەستی نەنقەستیان بە سەر دادەدرێ، پشوویان کورت دەبێ لە کاتی هەڵچوون و گەرمەی خۆپیشاندانێکی، مانگرتنێ، شۆڕشێ، یا هەر کارێکی جەماوەریدا، کارەکە لە کەفوکوڵێ بەولاوە هیچی تێدا بەستە نابێ و وەکوو کەفی دەریا لە پڕ دەنیشێتەوە، یا بۆ تۆڵەساندنەوە لە یەکدی و قەڵتوبڕی یەکتر ناوری خۆش دەکرێ. بۆیان وەگێرام: لە کاتی ڕاپەڕیندا جەماوەر لە گەرمە نسکۆهێناندا دە گیانی یەکدی بەربوون وماڵی یەکدییان تالان و بڕۆ دەکرد..

مرۆڤ، هەرچەندە لە پلەیەکی زۆر بڵندی پێشقەچووندا، پێگەیشتبێ، بەڵام هەر کە شوان نەیپەرژایە مێگەل پاراستێ کار لە کار دەترازێ، هەنگینێ، یا گورگ دەیان خوا، یان ئاوەکی و ئاوارە دەبن...

ئەوەکەی بەغدا (١٦) نازناوی هەس. «ڕۆستەمولحوکەما» لە کتێبی «ڕۆستەموتتەواریخ»دا کە لە سەروبەندی کەریم خانی لەکیدای نووسیوە، لە باسی دوا شای سەفەوییاندا، شاحوسەینی بە بنەچەکە باب کوردی شاری زنجان و خەلیفەی شێخ زاهیدی هەردەوێلی و پاشانەکێ زاوای بەرێزی وە قۆبیە خزمی ئیمام مووسای کازم، دەفەرموێ: دیرۆکنووسانی پێشە خۆم فرەیان لەمەڕ پیاوی زلوزەبەلاح نووسیگە، بەڵام خۆ تەنێ هەر پادشا و میر و گزیر ناوی مبارەکیان لە کتێودا نەنویسریاگە، بگرە لە بەرەی ناودارانی شاری ئەسفەهان دەتوانم، بە سەتان ناوی ئێشیک ئاغاسیتان ئەڕا بنویسنم، کە پادشا وە منەتبارییەوە هەر ڕۆژە نازناوێکیان پێ دەبەخشێ... باوەڕ بفەرموو، زێتر لە (١٥٠) نازناوی تەنێ هەر بۆ «دلیل العشاقان» نووسیوە، ئەی هاوار وە ماڵم...

ئەوجا با ئەوەشت عەرزی خزمەت کەم کەسی مامی، خۆ لە مێژووگەیشتێ کارێکی ڕێژەکی «نسبی»یە . وێرای ئەمەش بە درێژایی مێژوو، لە سەروبەندی دێریندا بگرە تا دوا قۆناخی سیستەمی سەرمایەداری، دیرۆکنووسانی هەبووگن کە هەزار ئەمەر و ئەوسەریان فەرمووگە و خۆیان وە هەزار دار و بەردا داگە تا لە گەوهەری مێژوو و لە

فەلسەفەی وی حالی بن و پەی وە سۆنگە و هۆکارەیلی ڕووداوەکانی مێژوو بوەن و زانستانە هەڵیان سەنگێن. ڕوونە، ئەم لە مێژوو گەیشتنە و هەڵسەنگاندنی سۆنگە و هۆکارەیلی ڕووداوانە نەدەکرا لە ژێر ڕکێفی بارودۆخ و هەلومەرجەکانی کات و شوێندا نەبن.

زووتر، ئەم مێژوونووسانە دە سەروبەندێکدا پەیدا بوون کە گۆڕانکارییەکانی ئابووری و کۆمەڵەکی تازە پێڕۆکە دەبوون و ڕوونتری بێژم، مێژوو قۆناخی خاڵێ لە خاڵەکانی وەرچەرخانی خۆی دەبوارد. جا وەم بۆنەیەوە، ڕەنگە لەبار وێ ئەم ناوی زانایانە بێرینە سەر زوان: پۆلی بیۆس، سوماتیسن، ناگارجونا، ئۆرلیۆس، ئیبن خەلدوون و دیرۆکنڤیسانی سەدەی هەژدەهەم، وەک: ڤۆلتێر، مۆنتسکیۆ، دیدرۆ، سن سیمۆن، ژ.ب. ویکۆ و پاشانەکێ دیرۆکنیڤسانێد هەڤچەرخ بێد میانێ شپێنگلەر.

تا ئەوێ کە ئاشکرایە و کێشەی لەسەر نییە، یەکەم نووسیارێ کە مێژووی وەک زانستێکی تایبەت و سەربەخۆ لەقەڵەم دا و لێی وەکۆڵێ، ئیبن خەلدوونە. مانای مێژوو، ناساندنی مێژوو، بە زۆر قۆناخ و لە زۆر سەرەوە باسی لێ کراوە. هەر لە کۆنەوە یەکێکی وەکوو پۆلی بیۆس و سوماتسین کە هەر یەکە لە بانێک و هەوایەکەوە ئۆڕیتیانە مێژوو، یەکەمیان خەڵکی ڕۆژئاوا و دووەمیان خەڵکی ڕۆژهەڵاتە، بەڵام ئەوەت لەبیر نەچێ کە سەنگەر لە نیگای مێژووییەوە، لەم دوو بەشەی جیهاندا بە تەواوی، لێکدی دەچوون. پۆلی بیۆس لەسەروبەندی هیلینیدای ڕۆژگار بە سەردەبرد و ئەوەش ڕۆژگارێ بوو کە ئیمپراتۆریی ڕۆم لە ناوچەی دەریای سپیدا، بە ئێوی شوانی ئەتەوەکان و ئێکنێخەری وان و وە شێوەی ڕمووزنی دووگونەشۆڕکەرەوە و هەر خۆی حسێو، لە دنیایەکی پان و بەرین، کە لە گراڤەکانی بەریتانیاوە تا باختەریانای (Bactariana)، لە ئاسیای ناویندا دەگرتەوە، ڕادەگەیشت. سوماتسین لە ئیمپراتۆریی هاندا دەژیا، ئەم ئیمپراتۆرییەتە، سەرزەوینی ئێستاکەی کۆماری مەزنی چین و

ماچینی دەگرتەوە و فەرمانڕەوای بلندی وی، ناوچەیەکی بەرفرەوانی، لە گراڤەکانی ژاپۆنڕا تا ئاسیای ناوین، بەڕێوەدەبرد. لە نیگای کۆمەڵەکی و ئابوورییەوە سەروبەندی پۆلی بیۆس و سوماتسین قۆناخی کۆتایی مێژووی بگۆڕی دووروودرێژی کۆمەڵی کۆیلەتییە کە لەم دوو ناوچەی دنیای کۆنەدا فەرمانفەرما بووە. ئەم دەورانە کە یەکەم وەرچەرخانی مێژوو بوو بەسەروبەندی ڕووداوگەلی قووڵ و ئەزموونگەلی سەختی جەماوەر لەقەڵەم دەدرا. وەلێ هەمان دەوران بە نۆرەی خۆی گەنجینەگەلێکی گەورەی وەبەر هاورد و ئەڵها و تاسەی مرۆڤی بۆ فامین و زانینی وی بە چوار دەوریدا تەشەنە و حەوزەڵساندن دەدا. بگرە هەر ئەو ئەڵها و تاسەیە بوو کە شاکارەکانی پۆلی بیۆس و سوماتسینیان هێنایە گۆڕێ. ئەم دوو دیرۆکنڤیسە هەردووکیان، پەیدابوونی ئیمپراتۆریی سەربەخۆیان، دەقاودەق، وەک ڕاستەقانییەکی مێژووییە کە ئێوەرۆکێکی بە سوود و فرە بە نرخی هەڵسەنگاندن و هەریەکە بایی چەندە، بەو تەرحەیان نرخ بۆ دانان. ئەم سەروبەندە، لە نیگای هەردووکیانەوە سەروبەندی بەرەو لووتکە هەڵکشان بوو.

جگە لەم دوو زاتە، کۆششتی ئاگارجوونا لە ڕۆژهەلات و ئۆرلیۆس ئۆکۆستیۆس لە ڕۆژاوا لە سەروبەندی وارگوێزیی کۆمەڵی کۆیلەتییەوە بەرەو فیدرالیزم زۆر بەرچاوە. ئاگارجوونا، گۆشەنیگایەکانی خۆی لەسەر بنەمای یاساوڕێسای، کە بە بیروباوەڕی جیهانییەوە ئامێژن کردبوو، پەروەراند: بیروباوەڕێکی ئەوتۆ کە ئایینی بوودایی وای لێ کرد بە سەر لایەنی ئەتەوایەتیی هینددا زاڵ بێ و تخووب و کەوشەنی بەرتەسکی وی بەزێنێ و بە کەوشەن و سەرحەدەکانی دنیای ڕۆژهەلات بگەیێ. ئایینی بوودا، کە نوتفەی وی دە پزدانی کۆمەڵی کۆیلەیەتیدا گیرسابۆوە، ئیدی بە شێوەی ئایینێ لە دایک بوو، کە چاوەنۆڕی ئەوەی لێ دەکرا، خزمەتی کۆمەڵی فیودالی ئەو سەردەمە، کە کۆمەڵێکی نوێ و تازە پشکوتوو بوو، بکا. هەرچی ئایینامەکانی ئۆرلیۆس و ئۆگستینۆس بوون، ئەوە سەر بە

دنیای عیسەویییەتە و ئەوە ئایینێکی دیکەیە کە لەگوتن ئایینی بوودا، هەستەی وی لە کۆمەڵی کۆیلەیەتیدا چەکەرەی کردووە و ئێستێکە لە دنیای هێلیندا، لە قاڵبی ئایینێکی جیهانیدا دارێژراوە.

ئەم دوو مێژوونووسە، وایان هەست کرد کە لە مێژووی مرۆڤدا سەروبەندێکی نوێ گەڵاڵە بوو کە هەریەکە ئەم سەروبەندەیان وەک بەرەو لووتکەهەڵکشانێ وەسف دەکرد. پێیان وابوو ئەم لووتکەیە رزگاریی مرۆڤ لە لایەن دەسەڵاتێکی ئاسمانی بەش بەحاڵی یەکەمیان، بوودا و بەش بەحاڵی دووەمیان مەسیحەوەیە، بەڵام لە سەردەمی فیودالیزم (دەرەبەگایەتی)ەوە بەرەو کاپیتالیزم (سەرمایەداری) وارگوێزیدا لە خاڵێکی وەرچەرخانی دیکەی مێژوودا گەوهەری مێژوو بۆ جارێکی دی هەڵدەسەنگێندرێ و بە بەهایەکی دیکەوە دەنرخێندرێ. ئەم لە مێژوو حاڵیبوونە تازەیە، لە ڕۆژاوادا، زەق و زۆیتر بەرچاو دەکەوێ. غاینەی ئەمە، (ژ.ب. ویکۆ)یە. ڕامانەکەشی بە ناوی «خولێکی گەڕانەوە -Cy Recurning cles - یە. بەڕای وی مێژوو چەند دەورانێکە و هەر دەورێ، سێ قۆناخی وەدەمەوە هەس. دەوری بەربەرییەت، سەردەمی قارەمانان و چەرخی مرۆڤایەتی. دیارە چەرخی مرۆڤایەتی، بە لووتکەی هەر دەورێ دەزانی و باوەڕی وابوو کە لە دووی وی، دەوری ئاوابوون، واتە: دەورانی بەربەرییەت دادێ.

بە بڕوای ویکۆ، هەر «خولێکی گەڕانەوە» ئاوابوونی مرۆڤی تێدا بە پلەیەکی پایینتر لە پلەی پێشینی دەبینێ و هەر هەڵکشانێکی بەرەودوا گەڕانەوەش، مرۆڤ بەرەو لووتکەیەکی بڵندتر، کە تا ئەو سەردەمە هاژ، ڕێی نەکەوتووەتێ، هەڵدەکشێنێ. ویکۆ، بڕوای بە کاملبوونی ساکاری مێژوو، ڕاستەوخۆ، نەبوو، پێی وابوو، مێژوو بە دەوری خۆیدا ناخولێتەوە، بەڵکو بزاوتی وی ماریێچانەیە. جفزێ، واتە: هەرگیز بە جۆرێکی دیکە دووبارە نابێتەوە، بگرە هەمیشە هەر بەرەو پێشێ هەڵدەکشێ. بە ڕاستی ئەوەی کە لە ڕامانەکانی ویکۆدا سەرنج ڕادەکێشێ، ئەوەیە کە ئەو بۆ خۆی

دەگـەڵ چەرخی خـۆدا هاوچەرخـە، سـەردەمی خـۆی بە «سـەردەمی مرۆڤایەتی»، سەردەمی یاساوڕێـا و ئەقڵ و ئاوەز دەزانێ. ئەم خولە لە نیگای وییەوە بە سەردەمی مرۆڤایەتی و لەم ڕووەوە بە خولی لووتکە لە قەڵەم درا.

کاتێ مرۆڤ لە قۆناخی سەرمایەداری و سۆسیالیزمەوە بەرەو پێشتر دەپەڕێتـەوە و ئەڵـهـا و تاسـەی بۆ لە گـەوهەری مـێـژوو حـاڵی بوون پەرەدەسـتێنێ و تەشەنە دەکـا، دیرۆکنووسـانی تازەنەفەس هاتنەگۆڕێ: شپـێنگلەر و توینبی، دوو غاییـنەی سەرمایەدارین. مارکسییـەکان وایان سەدەق بۆ لێ دەدان کە پایدۆسـکردن و لەناوچوونی سەرمایەداری لە چەند بەشێکی دنیایێدا وا بە چاوە خۆ دەبینێ، بەڵام سەرمایەداری لەناو نەچوو؛ بە پێچەوانەوە، سۆسـیالیزمی ڕووسیا و ئەورووپای ڕۆژهەڵات لە ناوچوو و ڕووخـا. هەر بە پێی لێکدانەوەی مـارکـسـیـیـان، ئەم دوو دیرۆکنووسـە بیـروبۆچوونیـان دەگـەڵ دیرۆکنووسـانی دیکەدا لێکدی تاق و جـووت و دووفـاق بوون. ئەگـەر بیـروبۆچوونەکـانی پۆلی بیـۆس و سـومـاتسین، خۆشبینانە بوون، ئەوەتا ئەم دوو فەیلەسووفانەی فەلسـەفەی دیرۆکە، بە چاوێکی تا ئەندازەیەک، بەدبینانە و ڕەشبینانەیان دەڕوانییە دنیایێ..

توینبی بە قـەنـاعـەتێ گـەیشت کە سـەرمـایەداری لە تاو چاوچنۆکی و چلێسـیی خۆی ڕووی لە مرۆڤ و خۆڕسـک کردووە، مرۆڤیش و خۆڕسکیش بۆ قـازانجی بێ سنووری خـۆی بە هەمـوو بارێکدا دەتەقێنێـتـەوە. تەنانەت کارەکەی بە ئەنـدازەیەک هەڵکشـاندووە، کە مـرۆڤ لە چـاو کـەرسـتـەی بێ گـیـانەوە دەبینێ و وەک دار و بەرد و مـەکـینە و... تاد، هەروەک چارلی چاپلن پیشـانی دا و هەروەک مارکۆس دەڵێ، ڕەفتاری دەگەڵ دەکاو بەیەک ڕەهەندی لە قەڵەم دەدا...

وەلێ ئەم دووفـاقییـە لە دیرۆک حاڵی بوونە، لە کوێرا سەری هەڵدابوو؟ ئەمـە لەوەڕا سـەری هەڵدابوو کـە توینبی بە قـسـەی خـۆی، گۆیا هەر بیر و ئەندێشـەیەکی دیرۆکـینە هەیە بە ئیـسـتـیلاح ڕێژەکییـە، واتە: هەر یەکە لە

چاو بیرونەندیشەیەکی دیکەدا جوداوازە و بە هەلومەرج و بارودۆخی کاتی - شوێنەکیی خاوەن بیرو ئەندیشەکەوە، سەروکاری هەس. ئەمە باسی خۆرسکی بەرەی مرۆڤ.

مرۆڤ سوود لە پەندەکانی ڕابردووی خۆی کەم و زۆر هەر وەردەگرێ، لێ ئەمە سەروکاری بە سەنگی زانیاری و ئاستی زانستی وێستاکەیەوە هەس. ئەم زانیارییانەش هەمیشە ڕێژەکی و لە چاو یەکدیدا لێکدی جوداواز و مێژووینەن. کە دەڵێم مێژووینەن، واتە: کەڵەکەی ئەزموونی ساڵەهای ساڵی کۆمەڵە و هەر وا لە پڕێ نەهاتوونە گۆڕێ؛ چون هیچ چتێ بە کون فەیەکوونێ - مەگەر فەرمانی خودا بێ(؟) - نایەتە گۆڕێ.. لە دووەم دەیەی نیوەی پاشینی سەتەی بیستەمدا زانیاریی مرۆڤ لەمەڕ خۆی، لە زانستی دیرۆکینەی وی لە نیوەی سەتەی نۆزدەهەمدا، زۆر دەوڵەمەندتر و هاوداوێنترە. لە دواڕۆژیشدا زانستی دیرۆکینەی مرۆڤ، تا دێ فرەوانتر دەبێ؛ چونکە ئەگەر وا نەبێ، دەبێ مرۆڤ بەرەو هەڵدێر و زەلکاو سەرەونشێو بێتەوە. دیارە لەوێ ڕۆژێوە دیرۆک وەک زانستێ لە پێش مرۆڤدا قوت بۆتەوە تا ئەمرۆ، زانستی دیرۆکینەی مرۆڤ لەمەڕ ڕابردووی خۆی، بەرە - بەرە، ڕووی لە فرەوانی و تەشەنە و تەنینەوە کرد. لە ئاکامی دۆزینەوەی چتەیلی نرت و نوێباو کە ڕێکەوتووەتێ و هەڵیسەنگاندوون، ڕووی لە وردبینیتر کرد. دواڕۆژیش لە چتی نوێباو ناوسە و مرۆڤ تا دێ چتی نوێباوتر دەدۆزێتەوە. خۆ ئەگەر گریمان، مرۆڤ لەمەڕ هێڵە بنەڕەتەکانی پایەی ڕابردووی خۆی بە تەواوی حاڵی بووبێ و سرشتەیلێکی تازەی کە ڕەنگە لە دواڕۆژدا وە سەر خەرمانی زانستی دیرۆکینە کەڵەکە کرێن، ئەوە تەنیا لە زەوینەیلێکی تایبەتیدا دەتوانن کاریگەر بن، جگە لەوەش، زانستی دیرۆکینەی مرۆڤ، پێ بە پێی بارودۆخ و هەلومەرجی کات و شوێنی بە کەوشەن، هەر بە کەوشەنە و لەو کەوشەنانە زیاتر ناتوانێ بترازێ.

هەر جۆرە لێکدانەوەیەکی کە لە بابەتی دیرۆکی ژیانی مرۆڤ بەش

بەوەندەی لە توانستی مە دایە و لە ئەزموونەکانی پێشووی خۆمان ئەنجام لێ وەرگرین و بەش بەوەندەی کە بتوانین دوارۆژ لەسەر پایەی ئەزموونەکان پێشوێژی بکەین، ئەنجامبەخش دەبێ.

هیچ گومان لەوەدا نییە کە ئەزموونی مێژوویینەی مرۆڤ فرە گەورەس. تەنانەت ئەگەر ئێمە بەسەرکردنەوەی ڕابردووی خۆ لە سەروبەندی بە دیارکەوتنی نوخشەی نیشانەکانی دەوڵەت هاتنە ئاراوە، دەست پێ بکەین، واتە: بەر لە هەزارەی چارەمی پ. ز. هەنگێن خۆ هەر هیچ نەبێ لە ژیانی مرۆڤمان لە مەودایەکی لە (٦) هەزار ساڵ زێتردا، وەکۆڵیوە. دیارە ئەم شەش هەزار ساڵە بە تەواوەتی بەشی ئەوە دەکا کە هێڵە ئەسڵییەکانی ئەو ڕێگایەی کە مرۆڤ بڕیویە، نێوەرۆکی ئەم ڕێگایە و هۆ و بەریانی هەموانییی وی نیشان بدا. لەمەش بترازێ، هۆکاری ئەزموونی مێژوویینەی سەروبەندی هاوچەرخیش، لەمەڕ سوود لە ڕابردوو وەرگرتنی مرۆڤ کامڵتر و دیارتر دەکا و هێڵەکانی دوارۆژ، یان بە لای کەمەوە دوارۆژی نێزیک بەدیار دێخن.

لە مێژوودا، هێندێ سەروبەندی ئەوتۆ هەن کە دەلالەت لە سەروبنی دوو خولت، لە دوا دوای سەردەمێکی گەورە و سەرەتای خولێکی تازە بۆ دەکەن. جا ئەم زەمانەیلە کە لە دوارۆژدا پەردەیان لە ڕوو هەڵدەماڵدرێن، بە وەرچەرخانی شۆڕشگێڕانەی مێژوو وەسف دەکرێ.

نوخشەی یەکەم وەرچەرخانی مێژوو، داتەپینی دنیایێ بوو کە جیهانی کۆنی پێ یەژن. لەم سەروبەندەدا سیستمی بەندەگی، بە ناوی سیستمی کۆمەڵەکی - ئابووریی داسەپاو، فەرمانفەرما بوو، بەڵام ڕۆژگاری هاتەگۆڕێ ئەم سیستمی بەندەگییە، وەک سیستمێکی داسەپاوی جیهانی لەبەر یەکدی هەڵوەشایەوە.

دوا نمایینەی بەندەگی لە ئاسیای ڕۆژهەڵاتدا، ئیمپراتۆریی هان و لە ئەورووپای باشووری و ئەفریقیای باکووری و ئاسیای ڕۆژئاوا، ئیمپراتۆریی ڕۆمی ڕۆژئاوایی بوو. ئیمپراتۆریی هان لە سەتەکانی دووەم و سێیەم و

ئیمپراتۆریی ڕۆم لە سەتەکانی چارەم و پێنجەمی ز. دا ڕووخان. ئەم گۆڕانکاریيانە، بەرە - بەرە، ڕووناکیی لێ کەوتەوە و پەردەی لە ڕووی دوارۆژ هەڵمالی و مژدەی پشکوتنی سیستمی کۆمەڵەکی - ئابووریی فیودالیزمی هێنا.

دووەمین وەرچەرخانی گەورەتری مێژوو، لەبەریەکداوشانی دنیایەکە، کە سەدەکانی ناوینی پێ دەڵێن. ئێوەرۆکی کۆمەڵەکی - ئابووریی ئەم خولە، دەرەبەگایەتی بوو. خاوەنیەتیی زەوین بوو. ڕۆژگارەکیش داهات کە ئەم سیستمە داسەپاوەش پایدۆسی پێکرا. دیارە ئەم گۆڕانکاریيانە بەش بەحالی وڵاتە گەورەکان، لەسەرەتارا لە ئینگلستان و فەرەنسا ڕوویان دا، بەڵام پێوەندییەکانی کۆمەڵەکی - ئابووری وردە - وردە چاویان دەپشکووت و سەروسیمایان ئاشکرا دەبوو. ئیدی سیستمی سەرمایەداری داهات.

سێیەمین خالی وەرچەرخانی شۆڕشگێرانەی جیهان، لە سەدەی بیستەمدا ڕووی دا. ئەوەش ئەوە بوو کە سیستمێکی کرچ و کالی بە پەلەی سۆسیالیزم لە ڕووسیا و بە زۆرە ملێی پاش شەڕی فاشیەت و نازیەت لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات و لە چین و کۆریا و ڤێتنام تاد... هاتە گۆڕێ.

لە هەر یەکێ لەم شۆڕشە کۆمەڵەکی - ئابووریيانەدا، سیستمێکی چینەکیی لێک دووفاق و دڕدۆنگ، جێگەی خۆی بۆ سیستمێکی لەو بابەتە بەجێهێشت. بەڵام لە سێیەم خالدا کارەکە لە ڕەگ و ڕیشەڕا گۆڕابوو، مارکسییەکان لەو بڕوایەدان کە دەبوا ئەم گۆڕانکارییە بە کشکردن لە چینەکانی لێک دووفاق و دڕدۆنگ، دوایی هاتبا..

جا لەبەر ئەمەیە سەردەمی ئەمڕۆ دەرفەتگەلێکی گەورەتری لە تێگەیشتنی ڕابردووی مرۆڤ و هەروەها دوارۆژی وی بە دەستەوە دەدا.

دیارە سەردەمی هەوڵدان بۆ یەک تەوەرەیی، یەک جیهانی، سەرلەنوێ بە شێوەیەکی دیکە لە دیرۆک حالی بوون، ئەمانە سەرلەبەر بە

«دیموکراسییەت»ەوە، کە بووە بە بنیشتە خۆشەی بن ددانی هەموو نەتەوەکانی هاوچارەنووسیش و لێک دڕدۆنگیش لەم چەرخەدا.
ئەوەی یارمەتیی خاڵێکی دیکەی وەرچەرخانی ڕەوڕەوەی مێژوو دەدا، من بەش بە حاڵی خۆم، سریشتی مرۆڤ بۆ خۆی، تا دێ ڕێگا بەرەو یەکلاکردنەوەی کێشەکانی بە زۆرەملێ ماف لە خەڵکی داگیرکردن، بە بۆمبای کیمیاوی و گاز و بایۆلۆژیک مرۆڤ قڕکردن، خەڵک لە برسان مردارکردنەوە، ژن بە بەندە و کالای فرۆتەنی لە قەڵەم دان و حەز لە هەڵایسانی شەڕ و ئاژاوەگێڕی کردن و تاد... خۆشتر دەکا.
باشە، ئێومرۆکی مێژوو چییە؟ دیارە هەر کۆششێ لە بۆ دەرکی مێژووی جیهان، بتەوێ و نەتەوێ، ئەمانەت لە پێشدا قوت دەکاتەوە: گەلۆ مێژوو بە بەریانێکی دیار و بەرچاودا دەڕوا؟ ئایا ڕەوڕەوەی مێژوو گەوهەرێکی هەیە؟
بە پێی وەرامی ئەم پرسیارە، دوو جۆرە تێگەیشتنی فەلسەفییانەمان لەبەردەمدا زەق دەبنەوە: ڕامانەیێ دەڵێ: هیچ مانا و مەبەستێ لە ئارادا نییە. مێژوو دووبارەبوونەوەی هەتا هەتاییی ڕووداوانە و هیچی تێدا بەستە نییە، بەڵام بەرپەرچدانەوەی ئەم ڕامانەیە تا بێژی سانایە. شایەتیی واقیعییانە لەمەڕ ئەمە زۆرن. هیچ سەروبەندێ، هەرچەندە هێڵەکانیشی ڕەنگە وەک سەروبەندی پێشە خۆی بچن، وەلێ دەقاودەق دووبارەبوونەوەی هەمان نوسخەی وی نییە. کەس ناتوانێ لافی ئەوە لێ بدا کە دیموکراسیی ئەورووپای سەردەمی نۆزدەهەم دووبارەبوونەوەی دیموکراسییەتە کۆنەکەی ئاتینە. شۆڕشی سۆسیالیستی سەدەی بیستەم دووبارەبوونەوەی شۆڕشی بۆرجوازیی ئینگلیس و فەرەنسایە. کە دەڵێم دیموکراسییەت کە ئەوڕۆ وەختە بێژم جێگای هەموو سیستەمەکانی گرتووەتەوە، ڕەنگە لەبەر ئەوە باش بێ؛ چونکە هەر لەسای ویدا مرۆ چ وەک تاک و چ وەک کۆمەڵ، دوور لە کشکردن لە بەرابەر، دەتوانێ بێ ترسی فتکردن بیربکاتەوە.
ڕامانەیەکی دیکە یەژێ: نەخێر مەیل و لایەنگری لە مێژوودا هەیە.

مێژوو بەرەو سەروو هەڵکشینە و گەوهەر و نێوەرۆکی وی پێشکەتووانەیە، وەلێ بەشی هەرە زۆری ڕەخنەگەلێ کە لەم ڕامانەیە دەگیرێ ئەوەی بیروبۆچوون و دەرکی «پێشکەوتن» چتێکی ڕامانەکی و بێ سەروبەرە، یا هەر هیچ نەبێ بابەتێکی بە مشتومڕە و بە گۆشەنیگایەکانەوە بەندە، هەر یەکە لە ئاوازێ دەژەنێ.. نموونەگەلێ کە بە پێشکەوتوو دەزاندرێن، بە زۆری لە بۆتەی مێژوودا چتێکی ناپێشکەوتوون. بە ڕاستی ئەم ڕەخنەیە زۆر جێگای سرنجدانە؛ چونکە مەسەلەکە خۆی کە کێهە پێشکەوتووە و کێهە ناپێشکەوتووە، ئاغڵەبە، لەسەر بنەمای پێشەکی ڕیزکردنی لۆجیکانەی ڕووتە ڕامانەکی و وشکەکەڵەک سەروبەر دەنرێ. لەوە دەچێ، لەبارترین ڕێگا بۆ چارەسەری کێشەی لە «گەوهەری مێژوو» حاڵی بوون، ئەوەیە دەستەوداوێنی مێژوو، هەر خۆی ببین و هەڵسەنگاندن و شیکردنەوەیەکی بێ لایەنانە - ئەگەر بکرێ، بەڵام هەرگیز ناکرێ - لە مێژووی شەش هەزار ساڵەی مرۆڤ، لە هەموو بوارەکاندا، وەکار نێخرێن. جا هەر لەبەر هەندێ، تەشەنەکردنی مێژوو و پاشان لە نێوەرۆکی مێژوو وەتۆژین، کارێکی خراپ نییە. بە پێی چەمکێ کە لە پێشەوە لەمەڕ مێژوو گوترا، دەبێ لە هەزارەی چارەمی پ. ز. ەوە، کاتێ شارستانیی میسر لە دۆڵی نیل و شارستانیی سۆمار لە مۆزەپۆتامیا بە ناوی نوخشەی دەوڵەتان سەری هەڵدا، دەست پێ دەکا. یەکێ لە نیشانەکانی ئەم سەدە تازەیە ئەوەیە کە بە پێچەوانەی پ. ز. کە گۆی زەوین، تا ڕادەیێ تەڕاتێنگای مرۆڤ بوو، ژیانی لەمێژینە لە ناوچەگەلێکی جوغرافییانەی دیاردا - لە کوانووی دەوڵەتە سەرەتاییەکاندا، خەستوخۆڵ ببۆوە، واتە: کە باسی مرۆڤ دەکرێ، زێتر ئەو مرۆڤانەی کە لە قەڵەمڕەوی ئەم دەوڵەتانەدا ناسەواریان بە دیارکەوتووە، بە نموونە لە قەڵەم دەدرێن.

کەواسا: ڕەوڕەوەی دوایی مێژوو، درێژای تەشەنە و تەنینەوەی بێ وچانی شانۆ جوغرافیایی و نەتەوەکییەکانی کۆمەڵانی مرۆڤایەتییە. بە نیوچە چاوگێڕانێ بە ڕابردووی دوور و درێژی مرۆڤدا، ئەو ڕاستییەمان بۆ

ئاشکرا دەکا کە مێژوو لە هەمانترووکەی پەیدابوونی خۆیەوە، هەمیشە ڕوو لە تەنینەوە و تەشەنەکردن بووە و تا خەیاڵ بفەرمووی خەڵکێکی بێ شوماری دنیا دەبەر دەگرێ.

ژیانی لەمێژینە لە دوو مەڵبەندی ناوچەقی سەرەتای خۆوە - میسر و سۆمار وردە وردە دەتەنێتەوە و سەرزەوینانی دراوسێ بە لای خۆدا ڕادەکێشێ. ڕەوڕەوەی مێژوو لە میسرەوە بەرەو باشوور دەتەنێتەوە و پێدەشتی حەبەشستان وەبەر خۆ دەگرێ و ڕوو لە ڕۆژهەلات دەکا، نیوچە گراڤی عەرەبستان و لە پێش هەمووانەوە، بەشەکانی دراوسێی وی، کە پاشان بە فەلەستین نێو نراوە، بە خۆوە تێکدەبەستێ و بەرەو کەنارەکانی دەریای سپی پێش دەکەوێ و لە ئاسیای ڕۆژاوا سەرزەوینی ئێستای سووریا و لوبنان وە پاشە خۆ دەدا و ئەوجا بەرەو مێزۆپۆتامیا دەتەنێتەوە. ناوچەقی شارستانییەتێکی دیکەی سەرزەوینی مێزۆپۆتامیاش، لە دوو لاوە بەرەو پێش دەچێ: لە لایەکی بەرەو ئاسیای بچووک، سووریا و لوبنان و فەلەستین کە دەگەڵ شارستانیی میسردا تێکەڵ دەبوونەوە و لە لایەکی دیکەوە بەرەو پشت قەفقاس و ئێران.

ئەوجا، بەندە لێرەدا بەوەندە ڕەوتەی مێژوو دادەکەوم و هەر هێندەم کار پێیە، چونکە کوردستانەکەم کەوتۆتە نێوان ئەم سەرزەوینانە. ئەگەر وەگەڕێمە ناو کرۆکی باسەکە، کە بە سەرناوی : «سەرچاوەکانی بیری کوردەواری»یم نووسیوە، دیارە کوردەکە لە پێشان دەگەڵ ئەم وڵاتانەدا جۆشی خواردووە و سەروکاری دەگەڵ ئەوانەدا پەیدا کردووە.

باشە، ئەم حەمکە تەنینەوە جوغرافیاییانە، کە تەنیا ئاماژەمان بۆ چەند پارێکی کرد، بەش بە حاڵی نەتەوەکان چەند کار لە دابەشبوون و لەت و پەت بوون، یان یەک گرتنیان کردووە؟ بێ گومان ئەم تەنینەوە لەمێژینە جوغرافیاییە، لایەنی نەژادیی (نەتەوەیی)شی هەبووە: چون لەم تێکە و لێکەیەدا هەمیشە لکێکی نوێ لە کۆمەڵانی مرۆڤ، پێی هاویشتۆتە گۆڕەپانی مێژووەوە. لە هێندێ شوێن ناوچەگەلی تازە کە خەڵکەکانیان

هێمان ڕێیان نەکەوتبووە گێژەنەی مێژوو، لەسەر جۆخینی ناوچە کۆنەکان کەڵەکە بوون. لە هێندێ جێگای دی نەتەوەگەلی تازەکوورە لە مەفتەن و زێدی خۆیانەوە بەرێ کەوتن و ناوچە تازەکانیان وەبەر تاخت و تاز دا.

مێژووی خەڵکانی ژاپۆن، کورە، لاتینەکانی ئیتالیا، نەوەکانی گال و ڤەندال و غەیری وان نموونەگەلێکن ئەوە نیشان دەدەن کە چۆن نەتەوەکان بە وەرسووڕ و داسووڕی مێژووی دراوسێیەکانی خۆ کەمەنکێش کران.

هێورینی هۆزەکانی یۆنان لە ناوچەی می سێن "Mycenas" کە بەشێ لە ناوچەکانی لەمێژینەی کۆنی ناخرونۆخری هەزارەی سێیەمی پ. ز. بووە، نموونەیێ لە کۆچ و ڕەوی نەتەوە تازەکان بەرەو ناوچە کۆنەکانی مێژوو. مێژوو زۆرمان لەم نموونانە بە بیر دێنێتەوە: هەوارگرتنی ئارامییان لە سووریا، فینیقیا، بابلستان و باکووری مێزۆپۆتامیا لە هەزارەی دووەمی پ. ز. سەیەرییان بەرەو پشت قەفقاس و ئاسیای بچووک لە سەتەی هەشتەمی پ. ز. ، هەوارگرتنی هۆزەکانی "هسین پێ" Hsin Pi، هوون، "کیتان" Kitan و "چورچێن" Churchen لە ناوچەکانی باکووری ڕۆژهەلاتی، باکوور و باکووری ڕۆژاوایی چینی ئەمڕۆکە، کۆچ و ڕەوی گەتەکان، یارمانەکان Sarmate و سلاڤەکان بۆ باڵکان و تاد... نەخشەیەکی بزفت و سووڕوگوڕی نەتەوەکانمان پیشان دەدا..

خوێنەدەی بەڕێز، لە بەشی چارەمی باسەکەماندا چێتێکمان لەمەڕ فەلسەفەی مێژوو بۆ باس کردن، هەروەها باسی تەمەنی گۆی زەوین و بۆ یەکەم جار پەیدابوونی گیاندارو مرۆم لەبۆ کردن. هەروا بەدەم قسەوە باسی لە کوردستاندا پەیدابوونی مرۆی نیاندارتالیشم بۆ کردن. ئیدی هەروا بەرەو پرسیاری: ئەدی «ژیان کوو ڕسکایە» و کێ ڕسکاندوویە و خودا چییە و لە نیگای ئایینی جوولەکە و مەسیحی و ئیسلام و ئایینی سیک و فەیلەسووفانی ئەوڕۆی هەندەران و لە نیگای سۆفیگەریی ئیسلامی و بتپەرستی و ئاژەڵ (تۆتەم) پەرستی و لە نیگای خۆرسک پەرستییەوە شۆڕبوونەوە، وامان بە باش زانی کە باسێ لە ژیان و چۆن دروستبوونی ویش بکەین..

زانست ئەوڕۆکە «ژیان» وە تەرحە بزاوتێکی ماددە: بەرزترین شکڵی فیزیاوی و کیمیاویی پەدیدەکان لە قەڵەم دەدا. وەلای ئنگلسەوە ژین، تەرزی پێکهاتنی تەنە پرۆتینییەکانە: ئەو چتەیە کە توخمە بنواشەییەکانی پێکدێنێ، ئەو ئاڵووێرە بەردەوام هەمبەر یەکدییەیە کە دەگەڵ دەورووبەرە خۆڕسکەکاندا دەکرێ. ماددەی پرۆتینی، یان فۆسفۆر و ئەوانی دیکەی وەک ئەمانە، بەمانای سیستمی زنجیرە ماددەکانی تایبەت بە ژیان، دێ.

ژیان ئەوەسا کە هەرچتە لەنێو فۆرمە گیانداره ناوێتە جیاوازەکانی ئۆرگانیزمەدا، لە جۆری خۆی لە دایک دەبێ و دەمرێ. ئۆرگانیزمەکان، هەم دەگەڵ خۆرسکی بێ گیان و هەم دەگەڵ یەکدیدا، خۆ بە خۆ، پێوەندایەتی دەگرن و بەرە بەرە دۆزە بە گرێوگۆڵەکانی، لە ساکارترین فۆرمەکانەوە بگرە تا دەگاتە فۆرمی مرۆ، سیستمی ژیانێکی هەموانی کە بە گۆرانێکدا تێ پەڕیبێ، دێنەگۆڕێ. لایەنی هەرە ڕەسەنی سەرلەبەری گیانداران، کاری ئەزمکردن (مێتابۆلیزما)یە. پەرت و بڵاوبوونەوەی بنیاتە ئۆرگانیکەکان و سەرلەنوێ دروستبوونەوەیانە، واتە: ئۆرگانیزمەکان مادده بە کەڵکەکان بەلای خۆیاندا ڕادەکێشن و شیی دەکەنەوە و چتەکانی دیکە دەرداوێن.
زانست وێڕای وەی کە تا ئەوڕۆ هێشتا نەیتوانیوە نە نهێنیی چۆن دروستبوونی خودی ژین و نە سەت لە سەت دەسنیشان کردنی یاسایەکانی ژین بە تەواوەتی، ئاشکرا کا و لەو نهێنییە، تا ئیرۆژی بێ خەبەرە، تا ڕادەیەکی باش لە شرۆڤەکردن و لێکدانەوەیەکی فەلسەفیانەی ڕاست و دروستی یاسایەکانی ژیان و ئاشکراکردنی ئەو ڕێچکانەدا کە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو یاسایانە بەکاردەهێندرێن، دەوری گەورەی گێڕاوە.
دیارە ئەم جۆرە بیروباوەڕە ماتریالیستانەیە دژی بیروبۆچوونی فیتالیستەکانە. ئەوان پێیان وایە: ژیان لەسەرەتایەکی ژیەکیرا سەرهەڵدەداو سەت لە سەت پشت بە پرۆسە فیزیاوی - کیمیاوییەکان نابەستێ. ئەمەش بیروبۆچوونێکی ئایدیالیستانەی ئیفلاتونییە، بەڵام لە نیگای ماتریالیزمی دیالێکتیکییەوە، یاسایەکانی فیزیاو کیمیا، دەورێکی پلە دوو دەگێڕن. بەلای ماتریالیزمی دیالێکتیکییەوە ژیان یاساگەلێکی بیۆلۆجیکیی خۆی هەن. بەش بەوەندە لێوەکۆڵینانەی کە لەمەڕ ژیان ئەنجام دراون، ئەم چەڵەمە تیئۆریکییە هەموانی و فەلسەفیانەن: چەڵەمەی پێوەندیی نێوان پارچە و بتوون، ڕوخسارو نێوەرۆک، چەڵەمەی ڕسکانی پێش شکڵ گرتن «Preformation»، (واتە پێش وەی هیوولا ڕوخساری دەرکەوێ)، چەڵەمەی ئەوە کە

بوونەوەرە گیاندارەکان تا دێ بەرەو بارێکی بەگڕیّ و گۆڵ دەڕۆن، ئامانج لەمە چییە؟ چەڵەمەی چییەتی و جۆرەکیی یەکلابوونەوەی بیۆلۆجیکی؛ چەڵەمەی گەشەکردن و گۆڕان و تاد...یە.

بەش بەحاڵی فەلسەفەی ژیان، ئەوە دەبێ کورتەیەک لەمەڕ سەرهەڵدانی فەلسەفەی سەبجەکتیڤی ئایدیالست لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا لە ئاڵمان و فەرەنسایێ، کە شوێنهاوێر ئالاهەڵگری بوو بگێڕینەوە. ئەم فەلسەفەیە ڕەگ و ڕیشەی لە ماتریالیزمی میکانیکیڕا ئاو دەخواتەوە. ئەم فەلسەفەی ژیانە دەیهەوێ بەرتەسکی و سنووردارێتیی ماتریالیزمی میکانیکی بە تەرزێکی ئایدیالیستانە یەکلابکاتەوە. هاتنەگۆڕێی فەلسەفەی ژیان قەیرانی کە تا ئەوکی تێ کەوتووە فەلسەفەی بۆرجوازییە. واتە ئەوەمان بۆ بەدیاردەخا کە فەلسەفەی بۆرژوا تا چ ئەندازەیەک زانست بە چاوێکی کەم تاماشا دەکا و تا چ ڕادەیەک دەیهەوێ زانست بەرەو هەڵدێری کۆنەپەرستی و هیچیایەتی و نیهلیستییەت دابخزێنێ. فەلسەفەی ژیان لە ڕووی بابەتییەوەی، لێکدانەوەیەکی خواروخێچی ئایدیالیستانەی ڕەوتی کۆمەڵەکی - مێژووییەیە. تەوەرەی ئەم فەلسەفە دژ بە مادده و زانستە، برێتییە لە چەمکی ژیان کە دەنێو بزاوتێکی ئاکتیف و فرە شکڵ و شێوە و هەتا هەتاییدایە و سەرەتای دنیای ڕەها و بێ پایانە. بەپێی ئەم فەلسەفەی ژیانە، ژیان لە ڕێی هەستەکان، یان لەڕێی ئەقڵ و مەنتیقەوە نا، بەڵکو لە ڕێی سۆسەوە، دەرک دەکرێ: لە ڕێی ورووژان (بەر لە هەموو چێێ ورووژانی ئایینی)یەوە دەکرێ بچیتە نێو ژیانەوە. ئەم فەلسەفانەی ژیانە، خوار و ژوور، دەکرێن بە دوو بەشەوە:

یەکەمیان ژیان بە مانای بیۆلۆژیکی وەبەر باس و لێوەکۆڵین و سەرجەمی تایبەتمەندییە بیۆلۆژیکییەکان بە ملی سەرلەبەری واقیعدا دەبڕێ (بڕوانە بێرگسۆن)؛ دووەمیان ژیان بە بەرهەمێکی هێزە ڕۆحییەکانی سەر بە ورووژانە لە خۆڕا و ناماقووڵ و دەروونییەکان دەزانێ (بڕوانە. Simmer

Nietzsche, و Dilthey). بیره سەرەکییەکانی فەلسەفەی ژیان بریتییە لە سەرچاوەی ئایدیۆلۆجیای وجودییەت.

تەتبیقی بیری کێشەی ململانێ لە ڕێی مان لە ژیاندا بەسەر کۆمەڵدا، ڕێی بۆ ئەوە خۆش کرد کە بیری داروینیزمگەریی کۆمەڵەکی کە سیفەتێکی ڕیئاکسیۆنەری هەیە، بێتە گۆڕێ.

ئەوجا پاش ئەوەی کە چەنێکم لەمەڕ چییەتیی ژیان و فەلسەفەی ژیان و بیروڕای دوو فێرگەی دژ بە یەکدیی: ماتریالیزم و فیتالیزم بۆ باس کردن، دێمە سەر باسی ئەوەی کە ژیان دەبەخشێ، واتە: خودا.

خودا لە ئایینە یەکتاپەرستییەکاندا بە پێی تەورات و ئینجیل و قورئانی پیرۆز بەم جۆرە دێتە پێش چاو. موسڵمانانی سەرلەبەری دنیایێ بە مانای (قل هوالله احد) لەو باوەڕەدان کە خودا یەکە و نابێ بە دوو و لە ئایەتی ژمارە (٢٢)ی سوورەتی بەقەرەدا خوداوەند دەفەرموێ: «ئەو خودایە هەردی بۆ کردوون بە ڕایەخ، ئاسمانی بەرزکردەوە و ئاوێکی لەو حەوایە بۆ باراندن، هەموو جۆرە بەروبووی - بە هۆی ئەو ئاوە - بۆ ڕواندن. دەیسا کە ئەوەو زانیوە، چۆن شەریکان بۆ ئەو خوایە پەیدا دەکەن؟» (تەرجەمەی هەژاری شەرەفکەندی). پەیامبەرانی یەکتاخودایی دیکەی وەک نووح و ئیبراهیم گوێ بە فەرمانی خودای پێوارو نادیتەن و بڕوایان بە یەکتاییی وی هەیە و لە ڕێ و فەرمایشتەکانی ویدا سەریان فرۆ هێناوە. تا ئەوەی کە ئیبراهیم کوڕی خۆی بە قەولی تەورات ئیحساق و بە قەولی قورئانی پیرۆز ئیسماعیلە بە دەستووری خوداوەند لەبۆ قوربانگا دەبا، لە ڕاهی خودای سەرژێکا. خوداوەند کە گوێ بە فەرمانی و گوێ ڕایەڵیی بێ چەند و چۆنی ئیبراهیم دەبینێ، قۆچێکی قوربانیی لەبۆ دەنێرێ کە لە جیاتیی فرزەندی خۆی وەکوژێ، هەروەها نووح کە لە بڕوانەهێنانی نەتەوەی خۆی و خراپەکاریی وان دنیای لێ وێک دێ و تەنگی پێ هەڵدەچندرێ، بە فەرمانی خوداوەند کەشتی سازدەکا و لە هەرچی نێرو مێیە جووتێکیان دەنێو دادەنێ و خوداوەند لە سای وەی لەتۆفانی ڕزگار دەکا. پەیامبەرانی

رابردوو له مەسەلەی یەکتاپەرستی و بڕوا بە خودای یەکانە و توانای ڕەهاو دەگەڵ پەیامبەرە لێبڕاو و نەبەز (ئولولعەزم)ەکاندا قسەیان یەکە و پشتیان بەخودای توانا بەستووە، سەرەتا و ئاکامی کارانیان وەپاڵە وی داوە.

سەرلەبەری هەستی، سەر بەوە و ڕوو لە هەر کوێیەکی کەی ڕووت لە خودایە. لە ئایەتی (١١٥)مینی سوورەتی بەقەرەدا بەم ئاوایەی فەرمووە: "خۆرهەلات و خۆرئاوا - هەرتک - هی خودان، ڕووبکەنە هەر لایەکی، خوا لەوێیە؛ زانستی بەربلاوەو ئاگادارە" (وەرگێرانی هەژار). هەروەها لە ئایەتی (١١٧)ی سوورەتی بەقەرەدا دەفەرموێ: "داهێنەری عاسمانەکان و زەمینە و هەر کە ویستی کارێ پێک بێ، فەرمان دەدا: ببە! دەبێ" (تەرجەمەی هەژار).

لە ئایەتی (١٦٣)ی هەر ئەو سوورەتەدا دەفەرموێ: "خودای ئێوە هەر خودای تاک و تەنیا (الله أحد)یە. بە غەیرەز ئەو هیچ شت بۆ پەرستن ناشێ؛ هەر بۆ خۆشی دەهەندەیە و دلۆڤانە" (تەرجەمەی هەژار). موسڵمانان خودا بە خودایەکی تاک و تەنیا کە پێویستیی بە هیچ شتێ و بە هیچ کەسێ نییە، دەزانن (الله الصمد). (لم یلد ولم یولد) خودا لە کەس نەبووە و نابێ. خودا توانای موتڵەق و ڕەهایە. هەر وەک لە ئایەتی (٢٦٠)ی هەمان سوورەتدا دەفەرموێ: "ئەوساش کە ئیبراهیم گوتی پەروەرەندەم! ئەی تۆ مریان چلۆن زیندوو دەکەیتەوە؟ نیشانم دە. گوتی ئاخۆ تۆ هێشتا باوەڕت نییە؟! گوتی: بەڵێ، بەڵام من گەرەکمە ئیتر بە تەواوی دڵنیابم. گوتی: دەسا چوار مەل بگرە و پەل پەلیان کەو بیانکە چوار کوت، هەر کوتێکیان بەسەر کەرێکەوە دانێ و بانگیان بکە، بە فرکە دێنەوە بۆ لات. بشزانە خوا چەندە خاوەن دەستەلات و لە کارزانە" (تەرجەمەی هەژار).

هەروەها لە ئایەتی ژمارە (٢٥٩)ی هەمان سوورەتدا دەفەرموێ: "یا ئەو کەسەی بە لای گوندێکا ڕادەبرد کە بەسەر یەکدا تەپیبوو، گوتی: کەی خودا دەتوانێ ئەمە زیندووکاتەوە پاش مردنێ؟ ئەوسا خودا بۆ ماوەی سەد

ساڵ مراندی و لەپاشان زیندووی کردەوە. لێی پرسی: تۆ چەندت پێ چوو؟ گوتی: ڕۆژێک. گوتی: نەخێر، ئەوا تۆ سەد ساڵە مردووی، دە بڕوانە خواردەمەنی و خواردنەوەت نەگۆڕاوە؛ تەماشای کەرەکەشت کە! گەرەکمانە بتکەینە پەندێک بۆ مەردم. لەم ئێسقانانە بڕوانە چلۆن تێکیان دەخەینەوە و دەناو گۆشتیان هەڵدەکێشین. کاتێ ئەمەی بۆ دەرکەوت، گوتی: وا ئێستا دەزانم خوا هەموو کاری پێدەکرێ"(تەرجەمەی هەژار). هەروەها لە سوورەتی کەهفدا بە تەواوی باسی چۆن باوەڕهێنانی خوڵامانی دەقیانووس کراوە و خوێندەی بەڕێز دەتوانێ وەیخوێنێ.

بە بڕوای موسڵمانان خودا تەن نییە - ناوێتە نییە، زانایە؛ توانایە، زیندووە و هەموو شتێ دەزانێ. خوڵاسە نامەوێ درێژە بەم باسە بدەم، چون هەموو موسڵمانێ ئاگای لە بیروبۆچوون و بڕوای موسڵمان بە خودا هەیە.

خودا بە بیروبڕوای ئایینی سیکان، بە ڕێبەرایەتیی نانک - گورۆ کە لە چینی سپاییان بوو، سەری هەڵدا. کتێوی پیرۆزی ئەم نەتەوەیە ناوی گرانت ساحیبە و ئێوەرۆکی ئایینیان یەکتاپەرستییە و ئێوی خودایان خودای یەکانەیە کە لەژێر سێبەری بیروبڕوای ئیسلامانی هیندا، لەسەر بنەمای ئینکارکردنی بت و ڕێز لە بت گرتندا گەشەی کردووە. بە باوەڕی وان "خوداوەندی موتەعال لەوە بڵیندترە کە لە پەیکەرێ لە بەرد یا فلزێ جێی ببێتەوە"

خودا لە نیگای زاناو فەیلەسووف و هونەرمەندێکی زۆری هەندەرانەوە بە مەوجوودێکی حاشا هەڵنەگر لە قەڵەم دراوە: Edvard Luther Kessel, Rassel charles Artist, George Herbert Bloned, Edmund Carl Korafeld, Elmer - W-Maurer, Paul Ernest Adolph, Cacil Boyce Haman - ئەمانە لاگوێلێکن لە خەرواری ئەو خودا بە مەوجوود زانینە. چلۆنایەتیی خوداوەند لە نیگای تەسەووفەوە، لەم قسانەی پایینەوە بەدیاردەکەوێ:

بایەزیدی بوستامی دەڵێ: "بە غەیرەز خودا لە جووبەکەمدا نییە - دە

جووبەی مندا لە خودا زێتر شتێکی دیکە نییە" و "چەند قەدر مەزنم، ئەمن سوڵتانی سوڵتانانم". مەنسووری هەللاج دەڵێ: "أنا الحق = من خودام" باباتایەری خۆمان دەڵێ:

بە دریا بنگرم، دریا تە وینم
بە صحرا بنگرم، صحرا تە وینم
بە صحرا بنگرم، کوهو در و دشت
نشون از قامت رعنا تە وینم

* * *

اگر دل دلبرە، دلبر کدومە
وگر دلبر دلە، دل را چە نوومە
دل و دلبر، بهم آویتە وینم
نذونم دل کە و دلبر کدومە
خوشا آنون کە از سر پا ندونند
میان شعلە خوشک و تر ندونند
کنشت و کعبە و بتخانە و دیر
سرایی خالی از دلبر ندونند

هەرچی خودای بتپەرستانە، ئەوە بە ئەندازەی ئەقڵ و ئاوەزی خۆیەسی. بتپەرستان بڕوایان بە ڕەگ و ڕیشەیەکەوە هەیە و بە نێوی ئەو ڕەگ و ئەسڵەوە، پەیکەران دادەتاشن و بە خودایان نێودەبەن. بیروبڕوای سۆمەرییان لە سێ ڕیشەوە: ئانوو Anu، خودای ئاسمانان و ئێا Ea خودای دەریاکان و بەل Bel خودای زەوین، سەری هەڵداوە.

تەورات و ئینجیل دوو کتێبن کە لەلایەن خوداوەندەوە بە سرووش بۆ مووسا و عیسا هاتوونە خوار، هەروەک کە قورئانی پیرۆز بۆ محەمەد هاتۆتە خوار. ئەم بڕوایە لە خودی قورئان کەوتۆتەوە کە دەفەرموێ: "ئەم کتێبەی - بە ڕاست - کە بۆ تۆ ناردووە، باوەڕ بەو کتێبانەش دەکا کە بەر

لەوی لە خــواوە بەرێ کــراون: تەورات و ئینجلیــشی لە بەرا هەنارد" (تەرجەمەی هەژار) (ئال عیـمران، ٣.٤٨: مـائیدە ٤٦: ئەعراف ١٥٧: تەوبە ١٢١١: فەتح ٢٩: حەدید ٢٧: صـەف ٦: جومعە ٥)، بەڵام وەک کـتێبی "تولد دیگر" ئەستەغفیـروڵلا، ئیددیعا دەکاو بەلای بیـروبڕوا لائیکەکانەوە تەورات و ئینجـیل، هیـچکامیـان نە یەک کـتێبن و نەش موسا و عیـسا لە ئاسمانەوەیان بەسرووش بۆ هاتوونە خوار. لە مێژووی جیهاندا تەنها کەسێکی دیکە جگە لە محەمەد کە لافی - ئەستەغفیروڵلا - لە خوداوە ڕاسـتەوخۆ کـتێبی بۆ هاتبێـتە خوارێ لێ دابێ، جوزێف ئیسمیت، دامەزرێنەری نۆلی ئاینیـی مۆرمۆن لە ئەمریکایە.

ئەوەی ئەوڕۆ لە دنیای مەسـیحییەتدا بە نێوی کـتێبی پیرۆز (Bible) نێو دەبرێ، کۆمەڵەیەک لە دووبەش "عەهدی عەتیق" و "عەهدی جەدید"ە کـە تەورات بەشێ لە بەشی یەکـەم و ئینجـیل بەشێ لە بەشی دووەمـە. عـەهدی عـەتیق کـە پێنج کـتـێبی هەوەڵی بەتایبـەتی "تەوراتی" ناوە، بەسەریەکەوە (٢٤)کتێب دەگرێتەوە، کە نە تەنها بە شێوەی لە یەک شوێن نەهاتوونە خوارێ، بگرە بەرە - بەرەو بەدرێژایی زێتر لە یەک هەزار ساڵ، بە هۆی کـەسـانێ یا چەند دەسـتـەیێ لە کـاهینانی جوو بە نێوی (٢٦) پەیامبەرەوە کە نێویان لەسەر ئەم کتێبانە داندراون، نووسراون. عەهدی جەدیدیش کـە چار کـتـێبی هەوەڵی وی بەتایبـەتی ئینجیلی پێ دەگوترێ، بەسەریەکەوە (٢٧) کتێب و ئامیلکەیە کە بە درێژایی دوو سەتە کەسانی جوێ - جوێ نووسـیویانە کـە هیچ یەک لەوان لە حەوارییـەکـانی عـیـسا نەبوون. عـیـسا تا دەمـە - دەمی سـەرەمـەرگی خۆی، لە بوونی کـتـێبێ بەنێوی ئینجیل ئاگادار نەبووە.

بنەمـای ژێرخـانی هەر سێ ئایینی "یەکـتـایی" ئەمـەیە کـە ئەفراندە و وەگەڕێنـەری جیـهـان، خودایەکی یەکـتایە و بە دوو نابێ کـە لە تەوراتدا، یەهوە، لە ئینجیلدا، باوکی ئاسـمـانی و لە قورئانی پیرۆزدا ئەڵڵای ناوە. لە هەر سێ ئەم کتێبانەدا ئەفراندنی جیهان و گووراندنی ئایەم بە دەستی

ئەم خوداوەندە بە شێوەیەکی چونیەک گێڕدراپتەوە. پەیامبەرانێ کە ئەو بۆ تیرەی مرۆڤی دەنێرێ پەیامبەرانێکی هاوبەشن و یاسا و ڕێساگەلێکی ئەغلەبە چوونیەکن، وێڕای وەش هەمور، چییەتیی ئاسمانی و زەوینیی ئەم خودایە لە ئاینەکانی جوو و مەسیحی و ئیسلامدا - وەک کتێبی تولد دیگر، ئەستەغفیروڵڵا ئیدیعا دەکا-: "بە شێوەیەکی هێند بنەڕەتەکی لێکدی جوداواز و هێندێ جار هەر بە ڕاشکاوی لێک دووفاقە کە بە زۆری، یەکتابوونی ئەم سێ خودایە دەکا بە چتێکی لە ئاوەز بەدەر و مەحاڵ. جیهانی یەکتایی با بە ئەزەیش بێ، لەیەک خودای یەکتایی زێتر نییە، بەلام بە کردەوە خاوەنی سێ خودایە کە خاڵی لێکدی جوداوازیان لە خاڵی لێکدی چوونیان گەلێ فرەترە؟!

خودای تەورات کە نێوی یەهوەیە و لە (تەوراتدا ٦٨٢٣ جار نێوی دووبارە بۆتەوە) تەنها خودای نەتەوەی جووە و بۆ خۆشی خودایەکی سەت لەسەت جووە. پەیامبەرانێکی کە لەلایەن خۆیەوەیان دەنێرێ، پەیامبەرانێکن تەنها پەیامبەرانی نەتەوەی جوون و کاریان بەسەر بێ باوەڕی و بە باوەڕیی خەڵکانی دیکەوە نییە. یاساو ڕێسایەکانی وان بەتۆمەری بە دەوری ئەم خولگەیەدا دەخولێتەوە کە بەرژەوەندیی تایبەتیی نەتەوەی جوو لە هەر ڕێیەکەوە پێویست بێ، دەبێ بپارێزرێ، خودای دەکرد دەبوو بەهۆی ئەوە کە زۆر ئاکامی ناتاکاری و نامرۆڤانەی لێ دەکەوتەوە و لە مافەکانی نەتەوەکانی دیکە خۆ نەبان بکرێ یان کەسانێ لە خوتوخۆڕایی و ناهەق وەک ئەورۆ لە فەلەستین دەکرێ بکوژرێن. دە بەستێنی ڕووداوەکانی ڕۆژانە، یا ڕێکەوتە گرینگەکانی لەگوتن شەڕوشۆڕو بەلای لابەلای ئاسمانی و زەوینیدا، یەهوە شەخسی، بۆ خۆی لە ئاسمانێرا بۆ سەر زەوین دێ، تا یەکەوراست بەکاروباری سەر بە نەتەوەی هەڵوژێردەی خۆی ڕابگا و لە کاتی پێویستدا بەڕێوەیان بەرێ. یەهوە لەم هەموو کارانەدا لە سەنگەری یەک خودای تاک و تەنهای جوولەکەوە هەنگاو هەڵدەگرێ، نەک خودای سەرلەبەری نەتەوەکان و هەموو سەرزەوینان.

هەروەها لەگەڵ پەیامبەری خۆیدا بڕیار دەدا کە ئەگەر کوڕانی ئیزرایێل خەتەنە بکرێن هەنگین بێ سێ و دوو لە پاداشتی وەیدا خاکی کەنعانیان هەتا هەتایە پێ دەبەخشێ و پاشانەکەش سەرلەبەری شارەکانی ئەم سەر زەمینەیان یەک لە دوو یەک دەداتێ، بەڵام بە مەرجێ نەک تەنها ژن و پیاو و زارۆک، بگرە گاوگۆتاڵ و پەز و سەگ و کتکیشیان بە زیندوویی نەهێڵنەوە. یەهوە، دەگەڵ پەیامبەرێکی دیکەدا کەباب و گۆشتاوێ دەخواو لەژێر درەختدا دەحەسێتەوە. لە تەک پەیامبەرێکی دیکەدا زۆران دەگرێ و پێغەمبەرەکە فرەی وەگیر تێرێ: لە شەوێکی تاریکدا لە دووی پەیامبەرێکی دیکەی لە بیابانێ دەگەڕێ، تا بە بیانووی خۆ خەتەنە نەکردنەوە، بیکوژێ. بە پەیامبەرێکی دیکەی دەستوور دەدا کە نانی ڕۆژانەی خۆی لەسەر تەپکە گوو ببرژێنێ و بیخوا. لە پەیامبەرێکی دیکەی دەوێ کە نیلکەم و بیلکەم دەبێ ژنێکی زینازادە و ڕووسپی لەخۆی مارە بکا. لەکن پەیامبەرێکی گلەیی دەکا کە دوو خوشکی وی کە ئەویندار بوون، یەک لە دوو یەک کڵاویان لەسەر ناوەو لەگەڵ کەسانی دیکەدا نازانم چییان کردووە. هەروەها لە کچانی نازپەروەردەی ئورشەلیم تووڕە دەبێ و فەرمان دەدا کە ئیدی ببڕای ببڕای موو لەسەر بەریان نەڕوێ. کەسانێکی کە ڕووهەڵماڵیوییان لە ڕوویدا کردووە ڕیخۆڵەیان لە کونی قوونیانەوە دەردێنێ. لەگەڵ شەیتاندا لەسەر بەندەی خۆی، ئەییوب گرێو دەکا. دەگژ پەیامبەرێکی دیکەی ڕادەچێ، لۆچی دەگەڵ ژنی یەکێ لەسەردارانی خۆیدا کاری ناشەرعیی کردووە؟ خۆ ئەگەر خۆی ویستبای، کێهە ژنی جوانی دنیایێ هەیە لۆی دەنارد و لە باوەشێی دەخزاند. وەک سەرۆکێکی مافیا جووەکانی میسری ڕادەسپێرێ کە لە هاوسێیە میسرییەکانی خۆیان هەرچەندی دەتوانن زێڕو زێو بە ئەمانەت وەربگرن، تا ئەوانە لە کاتی لە وڵات وەدەرکەوتندا دەگەڵە خۆیانی ببەن و بۆخۆشی لە شەوێکدا چەند میلیۆن ئەوجەوان و زارۆکی میسری بگرە گا وەمەڕو بەرخان بە دەستی خۆی دەکوژێتەوە.

له ئینجیلدا هەمان ئەم خوداوەندە دەبێ بە خودایەکی دوو شەخسییەتی کە لە هیچ ئایینێکی دیکەی ئەفسانەیی، یان لە یەکتاییی مێژووی جیهاندا وێنەی ناتوانی بدۆزیەوە. واتە بەپێی ئەوەی کە کێنهە ئینجیل لە ئینجیلەکانی چوارینە و کام نامیلکە لە نامیلکەکانی عەهدی جەدید بەدەستی چ کەسانێ نووسرابێ، لە دۆنی خودایەکی ترسناک و تۆڵەسێن و فریبکار و حەسوودی وەک یەهوەوە دەچێتە دۆنی خودایەکی بە بەزەیی و دڵچاک و دەهندە و بێ گرێکوێرەی دەروونیی وەک خودای ئاسمانی، حەزرەتی عیساوە و چییەتیی خۆی دەگۆڕێ. ئەوها خودایەک ناچارە هەمیشە ئەخشی کارگێڕیی هەبێ کە دە هەمان کاتدا هەم بە ڕک و کینە و هەم لە خەڵک بوردوو و هەم سەختگر و هەم ئاشتیخواز و هەم لە جوو زێتر چیدیکە نییە و هەم بابێکە کە بە فرزەندانی خۆی لە تەواوی ئەفرادی بەرەی مرۆ دەنوێ و ئاغڵەبە لەم هەموو زیدد و ئەقیز و دووفاقییەدایە.

لە قورئانیدا، خودا نە خودایە سەت لە سەت کینەتۆز و ڕووترش و گرژ و مۆنە بێ بەزەییەکەی تەوراتە و نە خودایە دوو شەخسییەتەکەی ئینجیل، بەڵکە خودایەکی ئەوتۆیە کە لەوبەری بێ پەروایی و ڕەهایی و خۆکامەیی و هەرخۆی حسێویی ئەوتۆدایە کە لە خۆی بەدەر هیچ یاسایێ، هیچ ئیرادەیێ و هیچ واقیعییەتێ هەبوونی نییە و تەنانەت "وەڵگێ، بێ ودمی وی لە درەختێ هەڵ ناوەرێ" و هەرچی لەئاسمان و زەویندا ڕوودەدا، لە کەرتەوە تا بتوون، بتەوێ و نەتەوێ بە هەمان شێوە ڕوودەدا کە ئەو بۆ خۆی گەرەکی بووگە. خودای مووسا قوورەتێکی ترسناکی ئەوتۆیە کە هەمیشە لەناو بەندەکانی خۆیدا دەژێ و هاوبەشی هەموو ڕاستی و دروستی و نادروستییەکانی وانە و خودای عیساش هەم بەسەر سەری مرۆکانەوەیە و هەم دەنێو دەروونیاندایە و خودای محەممەد (د.خ) تەنێ بەسەر سەری وانەوەیە و لە مەوقیعی فەرمانڕەواییی بێ سەرحەد و سنووری ڕەهاوە دەگەڵیان دەدوێ کە هیچ کاتێ لە کەلی خوداوەندیی خۆی نایەتە خوار (فرێن کلارک). ئەوجا لەنێوان ئەم سێ نموونانەی خوداوەندا،

ئەگەر نموونەی خودای مەسیحییەت باوکانەتر، نموونەی خودای ئیسلام سەرومرانەترە، ئەوە خودای جوو تەرِوپراوتر و خۆشخوێنترە، چون بەپێی ئەوەی کە لە تەوراتدا باسی دەکرێ هەم ئیلووهیمە جووەکە و هەم ئاتوونە میسرییەکە و هەم مەردۆخە بابلییەکە و هەم بەعلە فینیقییەکە و هەم زیئۆسە یۆنانییەکە و هەم ژۆپیتەرە رۆمییەکەیە و لەنێو سەرلەبەری خودایانی مێژوودا، هێچ خودایەکی دیکە، چ لە رووی خەسیەتی شەخسی و چ لە رووی فرەوانی و جۆراوجۆریی بەزموورەزمێکی کە بۆ خۆ دەستی تێیاندا هەبووە و هەر خۆی دەوری یارییەکەی تێیاندا گێراوە، شان لە شانی نادا و بارتەقای وی نییە.

رەنگە ئەگەر چەند بەزم و رەزمێکتان لەم بارەوە بۆ بگێرمەوە خراپ نەبێ.. یەکەمین پەیامبەری جووان، حەزرەتی ئیبراهیم (ئابرام)ە. لە حەبروون، لەبەرووستانێکدا لە خاکی کەنعان، تووشی خودا دەبێ. پاش زیافەت و مێوانپەرێزییەکی چەور و بەردڵگر، خودای بۆ ئاشکرا دەبێ. پاشان خوداوەند لە برایمی دەپرسێ هاوسەرت لە کوێیە؟ دەڵێ لە خێوەتێدایە و خوداوەند دەفەرموێ، بۆ کات و ساتی خۆی وەدەگەرێم و سارای هاوسەرت کورێکی دەبێ.

سارا لە دەرێ گوێی لەم قسەیە دەبێ، لە دڵی خۆیدا پێ دەکەنێ: کە شووەکەم پیرە و منیش لە بێنوێژیی مانگانە وەچووم و چۆن - چۆنی منداڵم دەبێ؟ خوداوەند بەبرایمی دەڵێ: سارا لۆ پێ کەنی؟ مەگەر کارێ هەس لەکن خودا لە کران نەیە؟ نەخێر هەر بە راستی سارا کورێکی دەبێ. هەنگێن سارا ئینکاری کرد، گوتی پێ نەکەنیم، چونکە ترسا بوو. خوداوەند گوتی نەخێر پێ کەنیت. پاشان رۆیشت و برایم بەرێی ئێخست.
ئەوجا خوداوەند گوتی: ئایا ئەوەی کە دەیکەم لە برایمی وەشێرم؟

جارێکیان خودا لە تاریکەشەوێکدا لە چۆلستانێکی دەگەڵ پەیامبەری خۆ یەعقووبدا زۆرانێ دەگرێ، ئەم زۆرانبازییە وێرای وەی کە تا سپێدەی بەیان درێژە دەکێشێ، بەلآم بەسەریدا زاڵ نابێ. ئەوجا کە دەزانێ پێی

ناوەستێ، لەقەیەکی لە ڕانی یەعقووب دەداو لە جوولەی دێخی و پێی دەڵێ، وا بەرەبەیانە، بەرۆکم بەردە، بەڵام یەعقووب دەڵێ، تا بەرەکەتێکم نەدەیێ دەستت لێ هەڵناگرم. خودا لێی دەپرسێ: نێوت چییە؟ دەڵێ: یەعقووب. خودا دەڵێ: نە، لەمەویاش نێوت دەبێ بە ئیزرائیل (نیسرائیل)؛ چون دەگەڵ خودادا ململانێت کرد و سەرکەوتی. ئەوجا یەعقووب گوتی کەواتا ئەتۆش نێوی خۆتم پێ بێژە. خودا لەوەڵامدا گوتی: لۆ لە نێوم دەپرسێ؟ ئیدی بەرەکەتی داێ، یەعقووب ئەو شوێنەی نێونا "فنۆئیل"، چون خودای لەوێدا ڕوو بە ڕوو دیت. ئەوجا کە لە فنۆئیل تێپەڕی ڕۆژی لێ هەڵات و دیتی کەمێ بۆی دەلەنگێ، جا هەر لە سۆنگەی وەیە کە کوڕانی ئیزرائیل تا بە ئەوڕۆکەش ماسولکەی ڕان کە بە کوردی ڕەگی سێبەندەی پێ دەڵێن، ناخۆن، چونکە خودا ڕانی حەزرەتی یەعقووبی لە سێبەندەڕا بەر لەقە داوە (کتێبی دنیا دروست کردن، بەشی سی و دووەم، ٢٢ - ٣٢). ئەمە یەکەمین جارە کە ناوی ئیزرائیل لەتەوراتدا هاتووە. مانای ئەم واژەیە لە زمانی عیبریی کۆندا بەرابەر بە خودایە و فنۆئیل بە مانای "خودام دیت"ە. سەیر ئەوەیە کە خودا دەگەڵ پێغەمبەری خۆیدا زۆران دەگرێ، وێڕای ئەو هەموو خودایییەی خۆی، نێوی ئەم پێغەمبەرەی نازانێ. لەمەش سەمەرەتر ئەوەیە کە حەزرەتی یەعقووب بەنێوی "ئیل" نێودەنێ کە نێوی خودا ئەفسانەییە بابلی و کەنعانییەکانە (واژەی "الە"، "اللە"، "اللات"، "اللهم"ی عەرەبی و "الوهیم"ی جوولەکانە هەموو خزمی یەکدین).

ئەمەش لەوەڕا سەری هەڵداوە کە خودا نەیتوانی حەزرەتی یەعقووب بە عاردیدا دا و دیارە بەمە بۆرە سیفەتێکی خودایانەی لێ بەدی هاتووە. وا دیارە هەر سیفەتێکی کە لە کێشی خواسایی مرۆیەکی دیکە بەدەر بە درێژایی مێژوو بووەتە هۆی ئەوە کە خاوەنەکەی بکا بە خودا،بەپیر، بە مەشایەخ، بە خاوەن هێزێکی نهێنی..

خوداوەند کە حەزرەتی مووسا ڕادەسپێرێ وەگەڕێتە میسرێ و ئەتەوەی

جوو له میسری دەربێنێ و مووساش چەندین بیانوو دێنێتەوە کە ئەو کارەی پێ ناکرێ و لە ئەنجامدا مل دەدا و ناچار هاوسەر و کوڕی خۆی سواری ولاغێ دەکا و بۆ میسرێ دەچێ و دارعاسای خودا بە دەستییەوە دەگرێ، وەلێ لەو کاتەدا خوداوەند هەست دەکا کە ئەو پێغەمبەرەی وی خەتەنە نەکراوە و لەمە هێندە تووڕە دەبێ کە لێ دەبڕێ شەوانە لە دووی بگەڕێ و سا بە هەر نرخێکی بێ بیدۆزێتەوە و بیکوژێ، بەلام زیرەکی و وریایی صەفوورەی خێزانی حەزرەتی مووسا فریای دەکەوێ، لە مەرگی ڕزگار دەکا. وا زێک دەکەوێ لە ڕێیێ کە خوداوەند لە دوو مووسا دەگەڕێ، بەدەستی خۆی بیکوژێ، صەفوورە بەردەستییەکی تیژ دەدۆزێتەوە، کلاوەی زەکەری کوڕی خۆی دەبڕێ و گۆشتە بڕاوەکە تووڕ هەڵ دەداتە پێش مووسا و دەڵێ ئیدی تۆ لەبەر ئەم خەتەنە کردنە، مێردی خوێنیی منی، ئیدی بەم فێڵە خودا مووسای بەرهەڵدا کرد.

ئەوجا با بزانین مەسەلەی خەتەنەکردن circumcision لە کوێوە ئاو دەخواتەوە؟ ئەم وشەیە ئەگەر بەپیتی گەورە Circumcision بنووسرێ، بە مانای (١)ی یەنایر، خەتەنەسوورانی حەزرەتی مەسیح دێ. دیارە ئەم خەتەنە کردنە لە ئەفسانەکاندا دەکرێ لە زۆر سەرەوە لێک بدرێتەوە. ئەو کتێبانەی کە بە فەرمانی یوشیا و عزرا بۆ خەڵک دەخوێندرانەوە، هەر ئەوانە بوون بە سەرچاوەی ئەو یاساو ڕێسا "مووسەوییانە"ی کە پاشانەکێ ژیانی جووەکانیان لەسەر دامەزران. یەکەم هەوڵ وکۆششت لەمێژوودا بۆ وەی بوو کە ئایین بکرێ بە پێگەی سیاسەتەکانی نەتەوەکان و دەسکەلای ڕێکوپێکخستنی ورد و درشتی سەرلەبەری ژیان. ڕێنان Renan لە مەڕ ئەمە دەڵێ: "ئەو شەریعەتە بوو بە بەرتەسکترین کراسێ کە بەزۆر دەبەر لەشی ژیانی مرۆڤایەتی کرا. خواردن، دەرمان، کاروباری تەندروستیی تاکی و بێنوێژی و زەیستانی و تەندروستیی گشت و لە ڕێی خۆڕسکانەی سێکسی لادان و خۆڕەحەت کردنی ئاژەڵانە. ئەمانە، سەرلەبەریان بوون بە بابەتە فەرزەکان و ڕێبەدێییەکانی خوداوەندی. لێرەدا دەبینین پزیشک چۆن

جارێکی دیکە وردە - وردە لە کاهین جویّ دەبێتەوە و لەپاشان چۆن دەبێتە گەورەترین نەیاری وی. کتێبەکانی لاوییەکان زۆر بە پەرۆشەوە هەوڵ دەدەن یاسا و رێساگەلێ دابنێن کە هیچ چتێ لە دەسەلاتبەدەری وان نەبێ..

لە شوێنێکی دیکەدا دەڵێ: "خوداوەند بە پەیامبەری فرە رێزدار و سەرگرانی خۆی، حەزقیال فەرمان دەدا کە بۆ مەودای (٣٩٠) رۆژان دەبێ پیسایی بەنانی رۆژانەی خۆدا بسوێ و پاشانەکێ بیخوا. هەروەها بە پەیامبەری زۆر هێژای دیکەی، هوشەع فەرمان دەدا دەبێ ژنێکی زیناکار و زینازادە لەخۆ مارە بکا. جگە لەمانە، کێ بەسەرهاتی ئەییوب پەیامبەری نەبیستووە و خوداوەند لە مەرجێکی کە لەگەڵ شەیتانیدای دەکا لەبارەی ئەزموونکردنی بەندەی گوێ بە فەرمانی خۆی و هەرچی پەتپەتیی دنیایێ هەیە پێ بکا، چون هەر ملکەچییە و سەرپێچی لێ ناکا. هەروەها خۆ حەکایەتی رۆنانی بورجی بابل و کورانی حەزرەتی نووحتان بیستووە، کە چۆن خوداوەند لەوە دەترسێ نەبادا ئەو بورجە هێند بەرزکەنەوە کە دەستیان بە نهێنییەکانی بگاو چۆن پیلانێکیان لێ دەکا کە زمانیان لێ تێک دەداو سەرلەبەریان سەر لێ دەشێوێنێ. هەروەها حەکایەتی سەمۆیێل پەیامبەرو کچانی ئورشەلیم کە خودا لەسەر لە خوبابوونێ کوو لێیان توورە بوو و فەرمان دەفەرموێ، ئیدی موو لەسەر بەریان نەروێ. جارێکی دی خوداوەند سکالا وەبەر حەزقیان پەیامبەر دەبا کە لە ئورشەلیم و سامیرا دوو پێتەختی پیرۆزی وی بە جارێ شیرازەیان تێکچووە و خەڵکەکانی چۆن دەستەوداوێنی ئەتەوە هاوسێیەکانی ئاشوری و بابلی و میسرییان بووگن، بەلام ئەم هانا وەبەربردنە بە زمانێکی دیکە عەرز دەکا کە نەک تەنێ ئاوازێکی خواسایی کتێبێکی ئاسمانیی پێوە نییە، بەڵکو نەوەی وەک ئەمە دەچێ لە Sex Shopەکانی ئەمڕۆکەشدا بە هاسانی دەست ناکەوێ.

هەروەها وا ڕووی دا کە لە ڕۆژی پێنجەمی مانگی چوارەم لە ساڵی سییەمدا (لە یەخسیری بابلدا) لەنێو یەخسیرانی چۆمی خابووردا بووم، ئاسمان قەڵشایەوە، فەرمایشتی خودام بۆ هات، گوتی: ئەی کوڕی مرۆ،

ئەتۆ بزانە کە دوو ژن هەبوون لە یەک داک و باو و هەردووک لە میسری کاری ناشەرعییان کرد و لەوێ گۆی مەمکیان ختووکە دان و میتکەیان خرۆشاندن. ناوی خوشکی گەورە ئوهلە (سامیرە) و ناوی خوشکی گچکە ئوهلیبە (نورشەلیم) بوو و ئوهلە لەدژی من زینای کرد و حەزی لە ئەویندارانی سەمەنجوونیلەبەر و فەرمانفەرمایان و والییان و سەرلەبەری کوڕوکاڵ حەزلێکردەی خۆی کرد و خۆی بە سەبیلخانەی هەر کەسێکی حەزیان لە شەوباخەڵیی بوو، کرد و بتپەرستیی هەر کێهەیان لە کوڕانی ئاشوور کە حەزی لێ کردبوو داوێنپیسکرد و دەستی لە ڕووسپیتییەکی کە لە میسریانی فێربوو هەڵنەگرت و هەر لە سەرێنیی غوباب بوونیدا سواری ببوون و میتکەیان خرۆشاندبوو و تۆماوی زینایان تێ ڕژاندبوو؛ لەبەر هەندێ ئەمنیش بە دەست ئەویندارانەوەم دا، بەدەست کوڕانی ئاشوور، ئەوانیش پەردەی شەرمیان لە ڕووی هەڵدایەوە، کوڕو کیژیان بەدیل بردن و لەشیریان کێشان و بۆ ژنان بوو بە پەندی زەمانە. ئوهلیبەی خوشکی دیت ئەویش دە هێندەی وی شووڵی داوێن پیسی لێ هەڵبڕی، بوو بە ماشووقەی کوڕە - کوڕەی ئاشۆیان. ئەوجا دیتم ئەویش تووشی گەماری بووە و هەردوو خوشک هەر هەمان ڕێگەیان گرتووە، بەڵام ئەمیان بە جارێ شووڵی لێ هەڵبڕی بوو کە چاوی بە وێنەی کوڕە - کوڕەی کلدانی مێزەر بەسەری کە لە دیواری هەڵکەندرابوو دیتێ، هەر بە جارێ هۆشی لەبەرپڕاو یەکسەر گیرۆدەی داوی ئەشقیان بوو و پەیک و قاسیدانی لۆ خەڵکی کلدانییان هەنارد. کوڕانی بابلیی بۆ هاتن، ئەوی لەگەڵی کردن کردی و بە چەپەڵی خۆیانیان دژوێن کرد. پاشانەکێ لێیان بێزیا و لێیان تۆرا. ئەمنیش هەر بەدەردی خوشکەکەی دیکەی لێی بێزیام، بەڵام ئەو پێی لە زیناکاری هەڵبڕی و بە ئاشکرا و بێ پەروا ئاشقێنیی خۆی دەگەڵدا دەکردن کە گۆشتیان وەک گۆشتی کەرێ و تۆماویان وەک تۆماوی ئەسپان بوو. ئەمێستاکەش ئەتۆ پێیان بێژە کە خودا دەفەرمێ "من ئیرەیی خۆم لە دژی تۆ بەدەنگ دێنم، تا بە توورەییت ڕەفتار لەگەڵدا بکەن، هەنگێن بە ڕووت

و قـــووتـيـت بەجێ دێڵـم بۆ ئەوەی بە ئاشکرا زینا کـــاری و دزێوی و ناشەرعییەت گەریت ڕەپ و ڕاست بەدیارکەوێ: چۆن منت لەبیرەخۆوەبرد و فەرامۆشت کـردم (کـتـێـوی حەزقـیـال پەیامـبـەر بەشی ٢٣ یەم، ١-٣٥).
بەشێکی دیکە لە سکالانامەی خوداوەند لەمە هێش سەیرو سەمەرەترە..
ئەمن ئەتۆم وەک گـیاوگـوڵی ئاڵفی ئاژەڵان کە لەدەشـتی دەڕوێ پەروەراند تا فـرلێژوو بووی و بە تەمـەنێ گـەیشـتی کـە کـیـژان لەو تەمـەنـەدا ئاڵـهـای ئارایشت و خـۆلەتەلدان دەکـەن و نەخـتـە - نەخـتـە مـەمکت خـڕبوون و گەندەمووت لەسـەر زهاری چڕ بوو، لەو دەمەدا بوو کە بەلاتدا تێپەڕیم ئەتۆ لە هەڕەتی عیشـق بازێدا بووی، داوێنی کەوێکەمم بەسـەر ڕووتدا کـێشـاو خـوێن و خـوڕم شـووشـتی و بەسـەرتدا ڕاکـشـام تا دزێـویی کـردەوەکـانت وەشێرم، ئەوجا کراسی ڕەنگاوڕەنگ و کەوشی عـابی و پشـتێنی کەتانێم دایێی و بە زێـوەری زێـروزێـوانم ڕازاندیەوە و نـان و هەنگوین و ڕۆنم لەبۆ هێنای، وەلێ تۆ بە جـوانیی خـۆ غـەڕا بووی و زینـای خـۆت کـرد بە سـەبیلخـانە و کـارخـانەیەکت لە بۆ زینـاکـاری ڕاناو لە هەمـان کـاتدا لە کووچەو کۆلان و ڕێویانانیش لە گاندانێت قوسوور نەدەکرد، لەجیـاتی وەی پوولت وێدەن، ئەڵتۆ پوولت بەوان دەدا، تا بە ڕۆژی نیـوەڕۆیێ سـوارت بن.
یەکێ لە نیـشـانە بەرچاوەکـانی یەهوەی خوداوەند ئەوەیە کە چەندین جـار ددان بەوەدا دەنێ کە بۆ خۆی بە ئەنقەست یارانی خۆی گۆمڕا دەکا و بەڕێی هەڵەیاندا دەبا، هەر بۆ ئەوەی بۆرە بیانوویەکیان لێ وە هەل بێرێ تا ئازارو ئەشکەنجـەیان بدا. ئەگـەر باسی حـەزرەتی مـووسـا وەخـوێنی دەبینی ئەم یاریی بانێـک و دوو هەوایـیـــەی یەهوە لە ڕوودانی ڕووبەڕووبوونەوەی مـووسـا لەگـەڵ فـرعـەوندا چەندین بەلای ناگەهان و سـامناکی لێ بەسـەر مـیـســـرییـان هێناوە! سـەیرتر ئەوەیە کـە هەر لەم بارەیەوە لە ئـینجـیلدا دەفەرمـوێ: گوتەی خودا دەڵێ لە سـەهیـۆن بەردێکی دادەنێم کە خـەڵکی پێ بە هەڵـەنگوتن و سـەرەنگرێ دەدەم و لەو بەردەی، تاوێرێکی دروست دەکەم لەسەری هەڵزەلێن. (نامەی پابـلـۆس پەیامبەر بۆ ڕۆمـیـان، بەشی

نۆیەم، ۳۳)". لە قورئانی پیرۆزیشدا خودا فەرموویە: "هەر شارێ کە قرمان تێ خست، تازە ناشێ بەرەو دوا بگەڕێنەوە" (ئەنبیا، ۹٥)

لەپێشان ئاپسوو Upsu و تیامات Tiamat بە مانای ئاوی سوێر و ئاوی شلەتێن تێکەڵ بە یەکدی بوون خوداکانیان لە لێکدانی ئەم ڕەگەزە هاتنە گۆڕێ. بەرە نوخشەکان هێزو گوردێکی ئەوتۆیان نەبوو، وەلێ پاشە وان نەژادێکی بەهێزیان لێ کەوتەوە کە بە گوردترینیان ئانوو و ئئا بوون. سەرەنجام لەنێوان خودایەکاندا ئاوری شەڕ هەڵایسا و تیامات بڕیاری دا کە سەرلەبەریان قڕکا. لەلایەن خودیانەوە مەردوک بۆ فەرماندەیی هەڵبژێردراو شەڕ دەستی پێ کرد. مەردوک تیاماتی بە دوو کوتەوە کرد. لە نیوەیەکی ئاسمان و لە نیوەکەی دووەم زەوین هاتە گۆڕێ. پاشانەکێ پەرژایە سەر مرۆ دروست کردن و شاری بابلی ڕۆنا. ئەوجا بیریان لەوە کردەوە کە مرۆ دەبێ هاوسەریشی هەبێ، خودایانیش بڕوایان بە جووتایەتی هێنا، هەروەک- ئانتوو Anntu یان بە هاوسەری ئانو Anu لە قەڵەم دا. نەتەوەی نێوبراو جگە لە خودایان، باوەڕیان بە ئەرواێ خراپەکار و عیفریت و جندۆکەش هەبوو و بۆ وەی لە گەزەن و زیانی وان بە دووربن، گوری و قوربانییان پێشکێش دەکردن. لە شەڕوشۆڕاندا گرینگترین کارێکی کە دەیان کرد، ئەوەبوو کە بتی ئەو شارەیان بۆ شاری خۆیان ڕاگوێزن. ئەمەش بەمانای ئەوەبوو کە تەواوی شاریان بە دیل بردووە. هەروەک دەزانین لە شەڕەکانی کلدانییاندا پەیکەرەی نانا Nana یان لە ئاشۆرستانرا بۆ کلدانستانێ وەگوێست. پاش (۱٦۳٥) ساڵ نانای مێچکە خوداوەند بە دەست کلدانییانەوە بوو، ئیدی ئەوە بو پاشانەکێ بانی پال، شای ئاشۆر توانی خوداوەندی نێوبراو کە لە ژێر دەستی کلدانییاندا بوو بۆ شاری ئورروخ وەگێڕێ. کاری بتپەرستی، جگە لە ئێرانییان درێژە دەکێشێ تا هاتنەگۆڕێی ئیسلام کە بتێکی زۆر لەنێو عەرەبی چۆلنشین لە کابەدا هاتنە پاڵێ و هەموو ساڵێ بۆ زیارەتی دەچوون تا ئەوەی کە هەر نەتەوەیێ بۆ خۆی بتێکی تایبەتی هەبوو وەک (٤)بتی گەورە بەناوی: لات، مەنات،

هوبەل و عوززا کە ناووبانگێکی فرەوانیان هەبوو. بتپەرستان لەنواوە لەسەر ئەو بڕوایە بوون کە بتەکان ڕۆزیدە، کارساز، هۆی دژمن بەزێنی و هێزبەخشن. بتپەرستان لەبۆ هەر بتێ ڕەگ و ڕیشەیەکیان هەیە، بە نموونە سۆمەرییان بۆ خوداوەندەکەیان بڕوایان بە سیفەتگەلێکی وەک تووڕەیی، نالوودەگیی شاوەت، ئەوین و ڕک و کینە هەبوو.

مەزنترین خودای سۆمەرییان ڕەببەتوننەوعی فرەوانیی نیعمەت بوو کە ڕۆزیی بە مەردمی سەر زەوین دەبەخشی. ئەم پەیکەرەیەیان دەبیچمی ژنێکدا بوو کە بە شیری خۆی دنیای شیرڕشێن دەکرد، ساز کردبوو. ئەم خوداوەندە لەکاشان، گورگان، دامغان، نەهاوەند و قەرەداغی کوردستان دیتراوە. پاشان لە ئاسیای چکۆلە و یۆنانستان بە ڤینۆس Venus ناسرا. نێوی ئەم مێچکە خوداوەندە لە شارەکانی مۆزەپۆتامیا بەنێوی ئۆرانینا و ئیشتار نامێ بووە.

بەش بە حالی خودا لەنیگای ئاژەل پەرستی (تۆتەم پەرەستی)ەوە ئەوەیە کە لەسەرەتاوە بەهۆی ئێن ئاتوم Ennatoom شا (پاتسی)ی شاری لاگاشەوە پەیدا بوو. ئەو مێچکە خوداوەندی مانگی بە جوانەگایەکی پڕ هێز کە چارەنووسی مرۆیانی لە دەستدا بوو، دەناسی و ئەویش هێزو گوردبەخش، سەروەری و شکۆبدە و پاشان ڕۆزیدە بوو. پاش پاتسی، جگە لە مێچکەخوداوەندی جوانەگا مێچکەخوداوەندی مار کە فەرمانفەرمای زەوین بوو، هاتە گۆڕێ، نەتەوەی لاگاش مارێکی پەپکە خاردوویان لە فلزات دروست دەکردو لە ملی خۆیانیان دەکرد و لەو بڕوایەدا بوون کە ئەم مارە لە بەلا و نەهامەتییان دەپارێزێ. جوانەگاپەرستان لە ئەنجامی شەڕوشۆڕ و بەزین و بۆڕخواردن، وردە - وردە بەرەو ولاتانی میسرو جەلیلە و هندستان بلاوبوونەوە. ئەو نەتەوەیەی کە لە جەلیلە هێوری بوون، بە دەستی حەزرەتی مووسا، ئەوی سەری بە فەتارەت چوو و قڕ کرا، چوو و قڕ کرا، ئەوی بڕوای بە یەکتاپەرستی هێنا، هێنا. بە بڕوای ئێرانی نەژادان، پێش پەیدابوونی زەردەشت، گایەک هەبوو، ئۆکداتیان پێ دەگوت

و ئەو گـایە یەكـەم گـایەک بوو كـە لە دنیـادا گـوورابوو. هێندێ لە مێژوونووسـان لەو بڕوایەدان كە گایەكە نێرە بووە و بەمەزنەی هەرە زۆری مێژوونووسـان مێینگە بووە و دەگەڵ كیـۆمەرس، پادشای پێشـداییاندا هاوزا بووە و لە یەک ڕۆژدا لە دایک بووگن. ئەم گایە لە هندستـان و میسر ناوبانگێكی فرەوانی پەیدا كردو میسـرییەكان تا پەیدابوونی ئیسـلامیش هەر بەنێـوی گـای ئاپیس Apis ەوەیان لە قـــەڵەم دەدا و بڕوایەكی تایبەتیـان بەو گایە هەبوو. كەمبـووجیە، شای ئێران كاتێ لەشكری لەسەر مـــــرییـان كردو شـاری مـەمفیـس Memphisی داگـیـركـرد، بۆ گـوێ ڕاكێشـانیـان فـەرمـانی دا كە گـای مـەمفیـسی بۆكن بێنن، كە هێنایان خـەنجـەرێكی دە زگی ڕاكـرد و گـای ئاپیـس كـوژرا. لەپاش مـاوەیەک كەمبـووجیـە بۆ دڵدانەوەی خەڵكەكە و قـایـل كـردنیـان گـایەكی ئاپیـسی دیكەی سـەروبەرناو لە پەرسـتگای مـیـســریانیـدا دامـەزراند. دەڵێن: مـیـسـرییەكـان بە بۆنەی كوژرانی ئەم گایەوە حەوتوویـەكی خشت پرسـە و تازیـی گـشـتـیـان ڕاگـەیاند و تازیـەـانەیان بۆ دانا! لە مـیـسـرێ لەپێش ئیسـلامدا، كتكی گوربەش بەگیانلەبەرێكی پیرۆز دەژمێردرا. بە جۆرێ كە كـاتێ گوربەیەک دەمرد، ڕێوەڕەسـمی تەرم بە ڕێخسـتنێكی بە ئابوتابیـان لەبۆ بەڕێوە دەبرد، لەشیـان مـومیـایی دەكرد و لەنێـو تابووتیـان دادەنا و ئەوجـا دەیان ناشت. كـاتێكی كـە قـەیسـەر، سـەرداری ڕۆمی شكسـتی بەمیسـرییـان خوارد، لەگەڵ سپـاییـانیدا پێی هاویشتە گوێدەریای نیل و لە هەمـــان ڕۆژدا یەكێ لە ســـەربـازانی، سێ هەزار گـــوربەی لەبن پێی ئەسپەكەیدا كوشت بوو. میصرییەكان وێرای یاسـاو ڕێسایەكی زۆر سەختی قەیسـەر سەربازەكەیان گرت و هێندەیان ئێلاترێن كرد تا گیانی لەدەست دا! پـلـووز (Pluse) كە قـەڵایەكی مـەحكەمی لە زاری نیلدا هەبوو، بەهۆی گوربە پیرۆزەكانەوە بە دەست سپاییانی كەمبووجیە كەوت، لەبەر ئەوەی كە قـەڵایـەكـە زۆر سـەخت بوو، پۆلیس و سـەربـازانی مـیـسـری بەوپەڕی لەخـۆبووردنەوە داكـۆكـیـــان لێ دەكـرد، ملی نەدەدا. تا ئەوە بوو كـە

کەمبووجیە دەستووری بە سەربازانی دا کە هەر گوریەیەکیان دەردەست کرد دەستەمۆی بکەن. سەرەنجام رۆژێکی هەینی سەربازانی ئێرانی لە حاڵێکیدا کە هەریەکە گوریەیەکی لە باوەشی خۆ کردبوو، هەڵمەتیان بۆ دژەکەی پلووزی برد. میسرییەکان هەر بەوەندەی کە چاویان بە سەربازانی ئێرانی و گوریەکان کەوت، پاشەکشێیان کرد. تەنانەت تاکە سەربازێکی میسری زاتی ئەوەی بە بەرەوە نەما کە هەڵمەت بۆ سەربازانی ئێرانی بەرێ؛ چونکە لە گوریە پیرۆزەکان زۆر هەراسان دەبوون، سەربازانی کەمبووجیە بەبێ ئەوەی کە تەنانەت یەک تیر لە کەوانیانەوە پرتاوکەن، شاری پلووزیان داگیرکرد! رەگورپشەی پشیلەگوریەی پیرۆز بەم شرۆڤەیەی پایین بە دیار دەکەوێ: ئیزیس Izis پیرۆزترین مێچکەخوداوەندی میسری لەبۆ ئەوەی بتوانێ لەدەستی یەکێ لە خودا بێ بەزەییەکان کە نیازی کوشتنی ویی هەبوو، گیانی بەسەلامەتی دەربەرێ، خۆی لە شکڵی گوریەدا سەروبەر نابوو؛ لەبەر هەندێ خوداوەند لێی خۆش بوو! ئەتەوەی پێرمانیش گوریە بە پیرۆز دەزانن، لەشەڕی دووەمی جیهانیدا سەربازانی پێرمانی کۆمەگیان بە ژاپۆن دەکرد. ئینگلیسەکان بیریان لە تەگبیرێ کردەوە، سەرلەبەری فڕۆکە و زرێپۆشەکانی خۆیان بە وێنەی کتکێکی گوریەی سپی ڕازاندەوە. بەم تەگبیرە، پێرمانییەکان لە جیاتیی وەی کۆمەگ بە ژاپۆنییەکان بکەن، بوون بە بەشێک لە هاوسوێندانی ئینگلیس!

گاپەرستی، تا ئەورۆکەش لە ولاتی هیندستانێ لە هەرمێن و برەودایە. ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی هیند گا پەرستن. گا پەرستی هیندستان لە سۆمەرییەکانەوە وەرگیراوە؛ چون سۆمەرییەکان بڕوایان بە بوونی گایەک هەبوو کە مەردوکی پێ دەگوترا و نێرە بوو. ئەم گایە هەر ئەو گایەیە کە لە شەڕێدا، تیاماتی بە دوو کەرتەوە کرد. لە کەرتێکیان ئاسمان و لە کەرتی دیکەیان زەوین هاتنە گۆڕێ، بگرە لەم ئاخرونۆخرانەدا مەهاتما گاندی لەبۆ پاراستێ و لە گەزەندە بە دوور گرتنی ئەم گیانلەبەرە، فرەی جەخت لەسەر دەکرد و ئەوەی بەخاڵی چەقی چەمبەرەی هیندوئیزم ئازناو پێ بەخشی و

ڕێزو ستایشی گای زۆر بە پەرۆشەوە ڕادەگرت.

خودا لەنیگای خۆرپەرستانەوە بەش بەحاڵی ئێرانییانی پێش زەردەشت پەیامبەر سۆسە دەکرێ. ئێرانییەکان لەپێشدا بڕوایان بە زەروان، کە چاکە و خراپە لەوڕا کەوتوونەوە، هەبوو: دنیای ڕۆشنایی لەسەرەوە و دنیای تاریکی لەژێرەوە دامەزراون و لەنێوان ئەو هەردووەدا هەوا هەیە. ئەوان زێتر ڕەواڵەکانی خۆرپکی وەکو خۆر و مانگ و چیاکان و ئەستێرەکانیان دەپەرست. سریشتی بەکەڵک و سپی و نووراني، دیۆس Davos (دێو) یا خودا و خودای خودایانی بەنێو پاتر Da- - Pater vos واتە بابی خودایان (هورمزد) نێو دەبەن. وارونا Varuna، خوداوەندی ئاسمان، ئیندرا Indra خوداوەندی شەڕ، ئاگنی Agni خوداوەندی ئاور، میترا Mithra، یا میهری خوداوەندی نوور و دادپەروەری و سۆما Suma خودای گیای پیرۆز هوم بوو (گیای هوما واتە گاوما تا ئێستاش لە ناوچەی قەرە حەسەن بۆ ماسی ڕاو کردن دە گۆم و گۆماواندا دەخوسێننەوە و ماسیی پێ سەرخۆش دەکەن و دەیانگرن) زەروانییەکان تا سەروبەندی ساسانییەکانیش هەر مابوون و ناو بەناو پەیڕەوانی زەروان لەبەرابەر زەردەشتیاندا بەرگرییان دەکرد. پلەو پایەی خۆر لە ڕادەیەکدا بوو کە پەیکەرەی هورموزیان بەخۆر دەچواند. سیفەت و ناوونیشانی زەقوزۆیی خۆری ئێزەدیان بەنێوی ئەسپی تیژڕۆ دەردەبڕی: جا هەر لەبەر هەندێ چەرخی پیرۆزی خۆر لەنێو ئێرانییەکاندا بەهایەکی تایبەتیی هەبوو و لەزۆر بۆنە و کاتی گرنگدا بۆ پیرۆز کردن و بە گەورە زانینی ئەم سریشتە ژنبەخشە، لەگەڵ خۆیانیاندا هەڵدەگرت و لە گزنگی ڕۆژهەڵاتن و ئاوابوونی خۆردا بۆ ستایشی وی ڕێوڕەسمێکیان بەڕێوە دەبرد. لەم کارەدا زێتر نەتەوە ئارییایەکان و سامییەکان هاودەنگ بوون. خۆر پەرستی یەکێ لە کۆنترین شێوەکانی پەرستن و ئایینە، بەش بە حاڵی کلدانییەکان ئەستێرە گەرۆکە پێنچینەکانی موشتەری، زوحەل، زوهرە، مەریخ و عوتارید و مانگ و خۆریان بە ڕەواڵی خودایان دەزانی. زوهرە

ڕەوالی نیشتار (خودای ئەوین) و موشتەری نمایەنەی مەردۆخ (خودای خودایان) بوون و بزاوت و هەلاتن و ئاوابوونیان لە چارەنووسی خەلک و ولاتی خۆیاندا بەکاریگەر دەزانین.

چینییە کۆنەکان زەوینیان دەپەرست. لەم ڕووەوە لە هەر گوندێکدا، بە مانای بڕشتی زەوین گردی توورەکەڕێژ و تەپەی بلیندیان لە خاک قوت دەکردەوە و لەسەر قوللەی وی درەختێک و بە چاردەوریدا نەمامانی پیرۆزیان دەچاند و گرد و تەپە توورەکە ڕێژانەیان بەنێوی شی Shiیەوە نێو دەنا. شی لە هەر گوند و دێهاتێکدا مەلبەندی پەرستیش و جێگای خوداپەرستیی دێهاتیان بووە کە تەشریفات و ئادابێکی تایبەتی نیسبەت بە خودایانی زەوین لەوێندەرێ بە عەمەل دەهات. خەلکەکە سروودی بە ئاوازو سەماوەیان بەڕێوە دەبرد و لەو بڕوایەدا بوون کە ئەم جۆرە کردەوانە لە پێشگای (شی)دا دەبێ بەمایەی خێروبێری زۆر. ئەم گردە توورەکەڕێژانە لە شاری مەرکەزی کە نشیمەنی خاقان بوو، هەموو (شی) بوون و فرە گەورە بوون و لە پێنج نهۆم خاک کە هەر نهۆمێکی بە ڕەنگێ بوو، ڕۆدەنا تا بەروبووی خوداپەرستی، لە داوێنی وان بە نسیوی سەرلەبەری خەلکەکە بێ، خاقان بۆ خۆی لە تاوساندا لەپێش ئەو گردە توورەکەڕێژەدا ئامادە دەبوو و زەوینی بە دەستی خۆی شۆ دەکرد و ئەروای زەوینەی دەپەرست و لەبۆ سەرپاکی مەردمی چین دوعای دەکرد. چون ڕۆژگارێ بەسەر چوو، زەوینپەرستی ڕەونەقی خۆی لە دەست دا ئاسمانپەرستی لەجێی وی بە هەرمێن و برەو کەوت. لە سەروبەندی پادشایی شانگەکاندا پەرستراوێکی ئاسمانی بەنێوی تی Ti یان شانگ تی Shang - Tiیەوە بوو بە پەرستراوی تەواوی خەلکی چین و پەرستراوی "تی" یان بە خوداوەندگار ئاسمانی یان خاقانی ئاسمان زانی و پادشایانی ئەو زنجیرەیە لەبۆ فەیز و بەرەکەتخوازی لێی دەپاڕانەوە و پلەوپایەی ویان بە لەبەرتر و بالاتری سەرزەوین لە قەلەم دا. کاتێکی نۆرەی پادشایی هاتە سەر زنجیرەی چوو Chous، لە جیاتیی تی ئازناوی

تـــین Tien واته: ئاسـمانیـان پێ بەخشی کە مەنزڵگای ئەروای باڵاو مەقامی نەزدیکانە، ئیدی لەبەر هەندێ ئەو زنجیرەیەیان بەنێوی تین تیرو Tin - Tiru واتە: کوڕی ئاسـمانەوە نێونا. ئەوڕۆ خۆرپـسکگەرییەکان بە پێچەوانەی یەکتاپەرستان، ئەفراندەی بوونەوەران بە خۆرپـسک دەزانن و لەو باوەڕەدان کە خۆرپـسک، خۆرپـسکی گووراندووە تا ئەسپەرەم (ڕێحانە)ی نێر دەگـەڵ هموەڵ مـاددەدا تێکەڵ نەبێ زاپمان و زاوزێ پێک نایە. زانایانی ژیناس دەڵێن: مادده خەسیەتەکانی ژیانی تێدایە. پێویستیی بە فەرزی هێزێ جگە لە هێزی مادده بۆ تەفسـیرکردنی پەیدابوونی ژیان لە گۆی زەویندا نییە. زانایانی کیمیاناس دەڵێن: تیشک لەبۆ تەفسیری مادده و لێکدانی ئۆرگانیکی و غەیری ئۆرگانیکی بەسە و سەروزیادیەتی.

نورقییە ئەسـیر aither بە ماددەی ئەسڵیی جیهان لە قەڵەم دەدا و فیساگۆرس بە ڕۆحی هەموانی کە سـەرچاوەی ئەروای جوزئییە، گومان لێ دەکـرد و ئانکسـاگـۆراس بە ئەسـڵی ناوی دەزانی، بەڵام لە نیگای زانسـتـمەندانی نوێوە ئەسـیر aither ماددەیەکە لەوپەڕی لەتافەتدایە و سەرلەبەری جیهانی پڕ کردووە و هەڵگری شەپۆلەکانی ڕووناکی و گەرمی و شـتـەکـانی دیکەیە. یەکـەم کـەسێ کـە تیـۆریی شـەپۆلی لە ڕووی ڕاگوێزرانی ڕووناکی، بەپێی شـیمانەی ئەسـیر aithe پێشـبینی کـرد هۆجنس، زانسـتـمەندی زانسـتـەکـانی خـۆرپـسک بوو. لەمەڕ ڕاسـتـینی ڕووناکی، لەناو زانسـتـمەنداندا دوو نەزەرییە هەن:

**ئـەلـف**- نەزەرییەی ئەتۆمی کە بەپێی تیشکەکانی ڕووناکی لە زنجیرە گـەردێکی یەکـجـار ورد و چکۆلە پێک هاتووە کـە بە ڕێکوپێکی لەسـەرچاوەی ڕووناکی جودا بۆتەوە و بەخێـرایی سێـسەت کیلۆمـەتر لە چرکـەیەکـدا بە فـەزادا بڵاو دەبێـتـەوە و لە بەتاڵایی و هەواو تەنە شەففافەکانەوە تێ دەپەڕن.

**بـێ**- نەزەرییەی شەپۆلی کە بە پێی وی تیشکی ڕووناکی لە شەپۆلە خواسایـیـەدەرە یەکجار خێراو کورتەکان پێک هاتووە و بە خێراییی

سێـسەت کیلۆمەتر لە چرکەیەکدا بە فەزادا بڵاودەبێتـەوە، پێویسـتی بە ماددەیەکی ڕەوان هەیە کە سواری بێ و بە هەر لایەکدا ویستی بڕوا، بڕوا. لایەنگرانی نەزەریـەی شەپۆلی کە شیمانەی ئەسیر aither یـان وەبـەر باس و لێـوەکۆڵین داوە لەو بڕوایەدان کـە هەڵگری شـەپۆلەکانی ڕووناکی مـاددەیەکـە بێ ڕەنگ و بێ کـێش و بێ بێن و بێ چێی دیکە و یەکـجـار ڕەوان و کە سەرتاسەری جیهانی، تەنانەت لە نێوان خڕکەکانی ئاسمان و ئەو شوێنەی کە پێی دەڵێین بەتاڵایی، پڕ کردووە و شـەپۆلی جۆراوجۆری ئەم ماددەیە کە جارێ بەشێوەی ماددە و گاهێ بە شکڵی دەنگ و ناوبەناو بەتەرزی گـەرمـایی و دە بەرابەر نەزەریـەکـانی دواییـدا، هێندێ جار بە شێوەی تەن و ماددەی خواسایی بەدیاردەکەوێ.

هێندێ لەو بڕوایەدان کـە ئـەم ئـەسـیـرە هەر بۆ خـۆی ئەو خـودای جیـهانەکـەیە، تەنانەت هیگڵ-یش تووشی ئەم وەهم و خەیاڵە ببوو و بە تەرزی ماتریالیستانەی بیر دەکردەوە، بەڵام لە بیری ئایدیالیستانە قوتار نەبوو..

جا لە بەسـتێنی باسی بت و خودای یەکـتـای چ وەک زەردەشتی ئێرانی نەژادان و چ وەک یەهوەی جـووان و چ وەک مـەسـیـح و چ وەک "اللە"ی موسـڵمـانان، دەبێ بزانین نەتەوەی کـورد تا ڕادەیەک بەر کاریگەریی ئەم جۆرە بیروبڕوایانە کەوتووە؟ تا ئەندازەیەک کەڵکی لێ وەرگرتووە؟..

وەڵامی ئەم پرسیـارانە لە بەشەکانی دیکەی ئەم زنجیـرە وتارانەدا، کەم تا کورتێ، وەپێش چاوی خوێنەی هێژا و زیرەک دەکەوێ.

سەرچاوەکان:


١- دەقی دەروونی، فۆلکلۆری، ئاینی.
٢- ئوورتانی پیرۆزی زێتر پشت بە لێکدانەوەی عەقڵانی سورعتەزیلە بۆ هێندێ شوێن.
٣- الملل و النحل للشهرستاني.
٤- الفصل في الملل و الأهواء و النحل / ابن حزم.
٥- تاريخ اديان جهان / عبدالعظيم رضايى.
٦- تاريخ اديان / مبلغى آبادانى.
٧- اديان آسيا / فريدهلم هاردى / ترجمه د. عبدالرحيم گواهى.
٨- جهان مذهبى / اديان در جوامع امروز/ريچارد بوش/ كنت دالرهايد و تاد...
٩- اديان و مكتبهاى فلسفى هند.
١٠- بودا /ع. پاشائى.
١١- فرهنگ اساطير يونان و رم.
12- Materyalist Felsefe Sozlugu.
13- Azerbayjan Sovyet Ensiklopidisi.
١٤- لغت نامه دهخدا.
١٥- تاريخ الشعوب الإسلامية / كارل برو كلمان.
16- Lenin, Din Uzerine, Ser yaylnevi
١٧- تاريخ جهان باستان.
١٨- الكتاب المقدس.
١٩- سرمايه / كارل ماركس.
٢٠- شعله طور / دكتر عبدالحسين زرين كوب.
٢١- الوعي والوعي الزائف / د. محمود أمين العالم.
٢٢- الاقتصاد السياسي / اوسكار لانكة.
٢٣- طلوع و غروب زردشتى گرى / آر. سى. زنر/ دكتر تيمور قادرى.
٢٤- رمز داستانهاى رمزى در ادب فارسى / تقى پورنامداريان.

«کاتێ مرۆڤەکان لە تاریکستانی نائومێدیدا بە مردوویتی لە دایک دەبن و دەگەڵ کەسانی دیکەدا سەروساخت پەیدا دەکەن، سەرلەنوێ لە دایک دەبنەوە»

## وتووێژێ دەگەڵ خاتوو جاکلیندا

«ژیانم بریتییە لە هیچ.» جاکلین، هەرچەندە بە دەگمەن خۆی دەگەڵ کەسانی دیکەدا ئاشکراش کا، ئەوە بیروبۆچوونی خۆی بوو لەمەڕ خۆی.
دەکرا ژیانی بە جۆرێکی دیکە با؟ دەکرا. بگرە مێژووی مرۆڤایەتیش دەکرا بە بارێکی دیکەدا هەڵکەوتبا. مەبەستم ئەوەیە کە مرۆڤ لە قۆناغەکانی مێژوودا، بەش بەوەندەی کە لە ڕاستییەکان دەگا، دەیتوانی لە دروست کردنی مێژوودا ئازادانە دەور بگێڕێ، واتە: لە بڕیاردان و ئەنجامدانی هێندێ چتاندا ئازاد بووە و ئازادە.
جاکلین سەرگرانە، لە هەموو چتێکی کە لە دەورروبەری ڕوویان دەدا بە وردی بیر لێ دەکردنەوە، بەڵان بیروبۆچوونەکانی لە دڵی خۆیدا دیڵێنێتەوە.
ئەگەر ناو بە ناو یەک - دوو چتێکی، ئەویش بە دەگمەن - کە بە بیردا

دێن و لە زاری دەردەچن، ئەوە وەک بڵێی ڕاستییەکان نەبادا لە قەپێلکی خۆیان وەدەرکەون و کوتومت وەکو ئاردی نێو دڕوویان لێ بێ، دوودڵانە بە چپەوەی دەگوتن. تروسکەیەک کە لە دوور چاویدا هەڵدەبوو و دەکوژایەوە، بە زمانی حاڵ دەیگۆ: «وا بیردەکەنەوە کە گێلم، بەڵام ئەمن گێل نیم.»
جاکلین لە دەستوبرد و هونەری ماڵ بەڕێوەبردنێدا کێهە سەرە کابانی وەستا دەگری، دەسکی لە دوو نەدەکرد و ئیرەیی و خۆزیی پێ دەبرد. تەنانەت هەر ژنە دەسڕۆیەکی منداڵداری بە ئەرک و نورک خۆزیی بەوە دەخواست کە کارامەیەکی لەو تەرزەی لەبۆ هاتبا ڕەدایێ و چەند سەعاتێکی کار و فرمانی ماڵەکەی بۆ ڕاپەڕاندبا، بەڵام جاکلین هەروەک لە ساناکردنی کاروباری ماڵانی دیکەدا ئەو وەستایەتی و کارامەییەی دەنواند، داخوا لە ماڵە خۆشیدا ئەوها بوو؟ دە کارەکانیدا تا بڵێی سەرڕاست و جێی متمانە بوو، بیری لە لایەنی هەرە گرینگ و هەرە ناسکی کارەکانی دەکردەوە، کەچی لە کاروبار ڕاپەڕاندنی ماڵەکەی خۆیدا زۆر خەمسارد و کەمتەرخەم بوو و نەیدەپەرژایە هیچ و بە هیچ ڕانەدەگەیشت. جاکلین داکیشی وەختی خۆی هەر ئیشکەری ماڵان بوو «هیچ سکاڵا و گازنێکم لە داکم نییە» دەیگۆ. «بۆ لێدان لێی دەداین، بەڵام باشی پێ گەیاندین.» جاکلین هێشتا تەمەنی حەوت ساڵان بوو داکی بێوەژن کەوت، لە سبیانێرا زوو وەدەردەکەوت، ئێوارانیش وەدەگەڕایە ماڵێ. «زۆر کەمان دەدیت.» دیارە جاکلینیش کەمتر زەین دەداتە دەرز و دەوران، زێتر خوو دەداتە لاساری. «چوونە فێرگە بە کەڵکی چ دێ؟ لەوە حاڵی نەدەبووم.» بە تووشی هاوڕێیەکەوە کە سەروساختێکی تایبەتی دەگەڵدا ببەستێ، مامۆستایەکی ڕێی نەقڵ شاندەرەوە کە لە دەرێی دنیا چکۆلەکەیرا دەستێکی بۆ درێژ کا، نەبیوو. نە دیپلۆمەیەک، نە شایەتنامەیەک، بێ ئەوەی هیچ چتێکی بە دەستەوە هەبێ و دەرروویەکی پێ بکرێتەوە، نەبوو و بۆ خۆی دەستپاچە بیبوو. «کە تەمەنم بە (١٦) ساڵان گەیشت، چتێکی گەوجانەم کرد.» چبکا، مێرد بە بابی منداڵەکەی دەکا و هەشت منداڵی دیکەشی لێ دەبن.

مـەڵێ کـابرا زۆری کـەیف بە منداڵان دەهات، بەڵام تا سـاوابوون.. کـە هەراش دەبوون «کارەکە تەمز ڕووی لە دژواری و سەختی دەکرد.» مێردەکەی تا لە سەربازیێ بوو و دارتاشێکی زۆر ڕێکوپێک بوو، لە سـەرەتاوە زۆری بە دەورویشـتدا دەهات. ڕاستیشت گەرەکە «جاکلین ناشقیشی بوو»، بەڵام زۆری پێ ناچێ کار لە کار دەترازێ. دەبیێـتەوە، کە ئافرەتێکی دراوسێی کـیژێکی شەش مـانگان بە بەرمەمکانەوەی بووە بە قـەپاتەی، ئیـدی لەو دەقەڕا متمانەی، بیرای بیرای بە مێردە نامێنێ. کابرا هەمیشە دەچێتە دەرێ و بە مـاڵێ ناکەوێ. ئەویش بە هەمـوو مەزەنەیەکەوە بیـر و هۆشی بە لای ئەودا دەلەنگێ کە هەمیـشە دەگەڵە وی ڕادەبوێرێ. لە پڕ مێردە خوو دەداتە مەیگوساری و نارەق خواردنەوە و لە سۆنگەی لە کار ماندووبوون، بەرە - بەرە کـاری کـەمتـر پێ دەکرێ و دەداتە باری کزی و کـەنەفـتی. دەست بە لێـدان و تێ هەڵدانی جـاکلین دەکـا «سـەرتاپای لەشم برینداربوو»، بەڵام هێـندەش شـەرمـەزار بووە، ئەو حـاڵەی لە کن کـەس نەدرکـاندووە «هەر لە باخچەیرا کە بەرەو مـاڵێ بەدیاردەکەوت، یەکـسـەر لەرزم دەهاتێ.» باشە بۆچی وازی لێ نەدەهێـنا؟ «ترسـام، لە وڵاتی وان دەژیاین. تەنێ بووم، کەسم نەدەناسی، هەر لەپاش شووکردنم سەروکارم بە مـاڵی کەسوکارمەوە نەمـابوو، چاردە سـاڵی خـشت بوو چاوم بە خـوشکەکـانم نەکـەوتبـوو، نەیدەهێـشت هاتوچووی دەرێی مـاڵێ بکەم. چوونە بازاڕ و شـمـەک کـڕین منداڵەکان دەیان کرد. تەنانەت چوونە سـەر تەرمی براکەشمی بەرەوبڕی لێ کردم. خوشکەکانم نەمابوون. تەنێ بۆ چوونە سـەر کار ڕێی چوونە دەرێی دەدام.» کە کار بەو حاڵە گەیشت، ئیدی هێندەی وەخت بە دەستەوە نەدەما بەشی چاودێریی منداڵەکان بکا. ناچار منداڵەکان، لە لایەن دەزگایەکانی خزمەتگوزاریـیە کۆمـەڵایەتیـیـەکـانەوە - کـاریان ڕاست بێ - خـرانە پێشـکاریی خێـزانەکـانەوە. دیارە جـاکلین دە بەرابەر ئەمـە هەسـتی بە شەرمەزارییەکی زۆر دەکرد. کاتێ خەڵک ڕووی توانجیان بە قـەستی لێ کـەمکردنەوەی تێ دەکـرد، دەیانگۆ: «ئەگـەر دایکێکی تەواو با،

منداڵەکانی بەو دەردە نەدەچوون.» بەلام جاکلین زۆر بە توندییان لێ بە دەنگ دەهات «ئەگەر ئەوانە لەو دیوی کارەکە حاڵی بان، ئەو قسانەیان نەدەکرد.»

پاشان، کە مێردەکەم لە لێدان و تێ هەڵدانمدا بە جارێ شوولی لێ هەڵکێشا، ئەمنیش دەستم بە لێدانی کرد، ئەسڵەن دەها زووتر دەستم بەم کارە کردبا. بۆ وەی واز لە مێردەکەی بێنێ، وەختێکی زۆری پێ دەچوو. مانگێ بەسەر تەلاق درانیدا تێ نەپەڕی، مێردەکەی تۆ خۆش: «هیچ خەمم بۆ نەخوارد، بگرە پێش کەنیم، ئێستا پێش دەکەنم، بەلام تا دەگەڵیدا بووم زەردەم وەسەر لێوان نەکەوت.» لەوێ ڕۆژێوە لەبۆ تەنێ یەک ئامانج هەڵپەی دەکرد: «یەکەم ئامانجم لە ژیانمدا ئەوە بوو کە بە خاوەنی ماڵ و حاڵی خۆم ببم.» هەر بۆیەکا لە پاش چەنانێک ئەو ئەپارتمانەی کە تێیدا بوو، کڕی. ئەم بە خێوی ملک بوونە بوو بە سەرچاوەی شایی بە خۆبوون و بە خۆوەنازین، ئەم بە خێوی ملک بوونە زێتری پشت ئەستوور و بەهێزتر کرد، بەلام لە تەنهاییش دەترسا، تاقیی کردبۆوە، وەلێ لەبۆی بەسەر نەچووبوو. ئێستا پیاوێکی دەژیاندا هەیە: «ئەوەش بۆ دڵنیاییی شەوانە پێویستە.» هێندێ جار تەنهاییی پێ باشتر بوو و چ گومانی لەوەدا نەبوو کە وازی لە مێرد پێ کردنی نییە: «کچی ئەم زەمانە کێههیان مێردکردن بە گرینگ دەزانێ؟ جا چییە، ئەمنیش وەکە وانم.» پیاوەکەش لەبەر وەی ژنی تەلاق دابوو و «پێویستیی بە سەرسووکی هەبوو» هەرتک، کوڕتێ و کەژێ لێک دەهەژێن، دەگەڵ یەکدیدا ڕێک کەوتوون. چێشت و مێشتەکە پیاوە لێی دەنان، بازاڕ و شمەک کڕینەکەش جاکلین دەیکردن. یەک شەموان، بە بازاڕاندا دەگەڕا، زۆر ئاشقە دیتنی شمەکان بوو، بۆ دەست بە کالا و قوماشی جوان جواندا هێنان، فراقی ڕەشی دەکرد. ئەم گەشت و گەڕانانانەی وەک خەونێکی بە پەلە و لەکەی ڕاستییەکان ئالوودە بوو، نەدەهاتنە پێش چاو. بە ڕەنجی شانی خۆی پووڵ پەیداکردن، هەست و خوستێکی بەهێزی ئازادی و سەربەخۆییی پێ دەبەخشی. کابرای

هاوڕێیشی، خانوویەکی چکۆلەی لە دەرێی شاری کڕیبوو؛ چونکە هەر زوو ئەوەی بە ڕاشکاوی پێ گوتبوو کە دە حاڵێکدا نێوانیان ئاڵۆز بوو، وەدەری دەنێ: هەر کاوناکاوێ ئەوەی بە بیردەهێناوە کە خانوو، خانووی خۆیەتی و بە ناوی مەیدانداری لێ کردنەوە، دەیگۆ: «هەر کاتێکی وازم لێ بوو وەدەردەکەوم، کەنگێم ئارەزوو لێ بوو بۆ سەردانی دۆست و هەواڵانم دەچم.»

زۆریان دەگەڵ یەکدی نەداخاوت. خۆشترین کاتی جاکلین ئێواران حەسانەوە، بە تەنێ خۆ دەبن پێخەوێ خزاندن بوو. کتێب مانای نەدەخوێندەوە، هەر هیچ نەیدەنۆڕییە تەلەڤیزیۆنی، لە جیاتیی ئەمانە زێتری حەز لەوە دەکرد کە چرای وەکوژێنی و بیر لە ڕابردووی بکاتەوە. بیر لە داکی، لە مێردەکەی، لە منداڵەکانی و لە دەهشەتی بێکاری بکاتەوە: «سبەی دوو سبەیەک، کار بەوە بگا منداڵەکان کاریان وەگیرنەکەوێ، زۆر ناخۆشە.» خەمی ئەوەی بوو کە منداڵەکانی ژیانێکی لە ژیانی ویان خۆشتر وە چەنگ نەکەوێ: «ئەمەش کە بەو ڕەنگەیە، کارێکی ناهەقە.»
جاکلین ئەمەی لە چاو زۆربوونی بیانییان لە فەرەنسا و بێشبرکێی وان لە خەڵکی ولاتەکە دەزانی. «ئەم بیانییانە دەرەتان و کارەکان لە ئاسانێ دەقۆزنەوە، کە ئەوە حاڵەکەیە هیچ بۆ فەرەنسییە دەسکورتەکان نامێنێتەوە. نامەوێ ڕەخنە لە عەرەب و ڕەشپێستەکان بگرم، بەلام ناهەقییەک لە گۆڕێدا هەیە. منداڵەکانی من کە بە کولەمەرگی دەژین، ئەوە خەتای وانە.» یەکێ لە کچەکان لە کارگە، ئەوی دیکەیان لە پۆلیسخانە کار دەکەن، سێیەمیان پاککاری دەکا؛ وەک بڵێی ئەم خێزانە هەتا هەتایە دەبێ بەو کەمبژێوییە ژیان بەسەر بەرن و نزمترین دەسمز وەرگرن.

باشە جاکلین بەم دەم کارەوە بیر لە چی دەکاتەوە؟ «وەڵلا بیر لە هیچ ناکەمەوە. لە کاتی کارکردندا یان بیر لە هیچ ناکەمەوە، یان بیر لە ئیربار و قاپ و قاجاخەکانم دەکەمەوە.» لە کارکردن، واتە: لە سەرقاڵی و سەرجەنجاڵیی ماڵێ دوورکەوتنەوە، چونکە جاکلین ماڵەکەی هەرچەند لە

بارودۆخێکی بە لەنگەر و سەرسووکیشدا ڕاگرێ، کەسانی دەوروبەرەکەی هەر یەکە وەک ژیشکێکی دڕکن دێنە پێش چاو. دە هاوسەروکاریەتییاندا، دەبێ هەمیشە دەست لەسەر پێتکە بێ. هەرچەندە خۆی وەک جاران بە ناسک نازانێ، بەڵام دە بەرابەر تیر و توانجی دەوروبەری وەنەبێ زۆریش خۆڕاگر بێ. بە تەنێ کارکردن، سەربەخۆیی بێ باشترە؛ چونکە لە قسە و قسەڵۆکی سەر زاری خەڵک لە جێی کار و کارگەکان دەسڵەمێتەوە: خەڵکەکە هەمیشە بێ وچان چتێکیان دەربارەت لەسەر زاری دەگەڕێ، قسەکانتان هەڵدەگێرنەوە، گرینگ ئەوەیە کە جاکلین سەربەرزی و بە شەرەفەوە ژیانی هەرگیز لە دەست نادا و سکاڵا ناکا. تەنانەت دەگەڵ مێردەکەیدا کوو دەگوزەرێنێ و ناگوزەرێنێ، ئەو باس و خواسانەی هەرگیز لەگەڵ خوشکەکانیدا ناکا. ئێستاش کە بۆ سەردانیان دەچێ، لەمەڕ چۆن چۆنیی ژیانی وانیش چ ناڵێ، ئەوانیش هەر بەو ئەندازەیە هیچ لەمەڕ ڕابردووی وی ناهێننە گۆڕێ: «دەنا دەزانن حەواسم چەند بەو قسانە تێک دەچێ.» بە نموونە: خوشکە چکۆلە شوومردووەکەی کە زۆر کەم، بەختەوەرانە دەگەڵ کابرایەکدا دەژیێ سەری زمانی و بنی زمانی باسی ئەوەیە کە «چۆن هەر سات و تا ساتێ لەسەر پێتکەیە و خەریکی بوخچە و بزگوڕ پێچانەوەیە و لە هەڵاتندایە.» جاکلین خۆی لەو جۆرە کارانەش ناگەیەنێ: «کێشە کێشەی خۆیانە، بەو چی؟» ئەگەر ناوبەناویش قەزاوەتی دەکارەکدا بکا، خوشکەکەی وەڵامی خۆی دەردەپەڕێنێ: «ئەتۆ خەریکی کاری خۆ بە.» هەروەک جاکلین دەڵێ، خوشکەکانیشی هەموو هەر وەکە وین: دەردەدڵی خۆیان دەرنابڕن.

لە نێو خێزانی خێوی منداڵی زۆروزەوەندەدا هەرا و بگر، بازاڕی هەمیشە گەرمە. بەش بە حاڵی هەرە گەورەکەیان کە گۆیا لە نێو منداڵەکانیدا زۆر بە باشی دەژیێ، ئەویش هەر مێردەکەی مردووە و دەگەڵ پیاوێکدا دەژیێ کە بێ نیزنی وی دەست بە ئاویدا ناکا: «ئاغای ماڵێ هەر خۆیەسی، پیاوەش ئەحمەقێکە بۆ خۆی، چونکە کیژەکەم زۆری

سەرباریەتی دەکا.» بەڵام وێڕای وەی ئەومشی وەپارسەنگ دیخێ: «خۆ لە ژیانی تایبەتیی منداڵەکانم هەڵ ناقورتێنم. ئەگەر لەبەر چاویشم بەشەڕ بێن، نێوبژییان ناکەم.»
ئەوەی کە لە دنیای جاکلیندا بووە بە مایەی هەرە نیگەرانی، کیژە تەمەن حەوت ساڵانەکەی پیاوەکەیە. ئەم کیژە کوتومت، وەک مێشەسەگانەیێ، بە نامان و زامان لێت نابێتەوە و گازت لێ دەگرێ. دایکی لە سەرێتیی شوویەکی ناکامەوە کە بە تەڵاق دران ئەنجامی هاتووە، لە نۆتێلێ دەژیێ. جاکلین وێڕای هەرچی پەتپەتی و بەسارهاتی، زڕداکێکی کلاسیکانەیە: «بە بۆنەی ڕۆژی دایکانەوە دەگەڵمدا نایەی، چون کیژی من نیت، ئەگەر بێشی بە بۆنەی ڕۆژی باوکانەوە بچۆ.» جاکلین هیچ گومانی لەوەدا نەبوو کە «ئەم کیژە لە بارێکی ڕەوانیی زۆر خراپدایە»: کیژە بەسەرهاتەکانی جاکلینی وردودرشت بەر گوێ کەوتبوونەوە و لە یەکبینە دەیگۆ: «بەدبەختێکە بۆ خۆی.» ئەم قسانە شاخ و باڵی بە جاکلین دەکرد. «چیکەم، ئەگەر کیژی خۆم با، دەمزانی چۆنم قەیار دەکرد.» کچە بە چاوقایی و زۆر سەقەت بەخێوکرابوو، لە ماڵێ دەست بە ئاوێدا ناکا: «نەسلی نوێی ئەم زەمانە هەرگیز نایەنە ڕایێ.» کە ئەمانەی دەگوت، کچە گەف و هەڕەشەی بە مەحکەمەدانی لێ دەکرد؟ «دە زیندانێت داوێن» دەیگۆ. جاکلینیش زۆر لەوە دەترسا سەری خۆی بە بەڵای یاساوە بئاڵێنێ. هەرچی کابرایەکەی جاکلین بوو، هەر وەکو بای بێ، خۆی لەو بەزمەوە نەدەگلاند و هەر سەیرکەر بوو: «پیاوە سەرسووکیی دەویست.» لەبەر هەندێ کە بگرە و بەردەکان بەو هەنگامەیە دەگەیشتن، جاکلین «دەفتەری چەکەکانی هەڵدەگرت و بۆ گەشت و گەڕانێ دەچوو.» دەفتەری چەکەکەی وەک پاسپۆرتێ بەڵگەی ئەوە بوو کە جاکلین ژنێکی سەربەخۆیە. لە شێوەی بەکارهێنانەکەی بنواڕی لەو بڕوایەدا بوو کە لە هونەری سەربەخۆبووندا، هەر دەتگوت پلە و پایەی وەدەست هێناوە، تا پێش چەند ساڵێکیش بۆ ئەوەی لە دوای تەوهین کرانێکی کە تووشی ببوو، سەرلەنوێ وەخۆ بێتەوە،

شێتانەی هەڵسوکەوت دەکرد: «بۆ وەی بیربکەمەوە پووڵم خەرج دەکرد، هەرزانی و گرانیی نرخی چتانم بەراورد نەدەکرد، ئێستا زێتر لەسەرەخۆم. پێم وایە هاورێیەکم لەم رووەوە، کاری تێ کردم. ئەو وردترە، پتری بەتەوشتر و هاوسەنگتر کردم. ئێستا زۆر باشم، جاران فرە گرژ و مۆن بووم. کۆمەڵی نیستیهلاکی بۆ خاوکردنەوەوەی دەماری کرژهەڵاتوو دەورێکی گەورە دەگێڕێ. جاکلین لە سەرێنیی لاوێنیدای (١٣) سەعاتی کاردەکرد، هەنکە کار کەمتر دەکا، بەڵام ئەوڕۆ لە هەر کەسێکی کەمتر دەست دەکەوێ. بەوێ کاری وای وەگیردەکەوێ کە پووڵی زێتری لێ دەردەست کا، بەڵام ئەو کارێکی پێ پەسندترە کە دەگەڵ خاوەنەکەیدا بکارێ باش هەڵ بکا و تێی بگا، نەک دەگەڵ کەسانێکدا کە بە ڕەخنە و توانج لێ گرتن سەرودڵی بگرن. هەر بۆ ئەوەی لەنگەر و هاوسەنگیی باری ڕەوانیی خۆی ڕاگرێ، بۆ چەند مالێ دەچێ و وەک هەر پارێز بەجێ هێنێ زۆر وردەکارانە سات و کاتەکانی بەسەر کار و فرمانەکانیدا دابەش دەکا. لە کن کابرایەک، بە درێژایی ڕۆژگار بە سەریدا بقیرێنێ و بنەڕێنێ کار بکەی و ئێوارانیش وەگەڕێیتە نک مێردێکی کە هەمیشە بەسەرتدا بقیژێنێ و بنەڕێنێ، ئەمە کارێ بوو لە توانست و کێنش بەدەر. «ڕاستە یەکێ لە ژنەکان بۆ پاکی و تەمیزی ماڵ ڕاگرێ، هەمیشە دەیقیراند و دەینەڕاند، بەڵام دڵی پاک بوو.» یەکی دی، کە ئەوەی یەک لە سەرەک وەزیرانی فەڕەنسایە، سەبارەت بە خەمۆکییەکی کە لە سۆنگەی جۆرەها نەخۆشین بەرۆکی گرتبوو شەو و ڕۆژ پالی لێ داوەتەوە، چیی پێ ناکرێ: «هێندە بە تەنگ خۆوە نەهاتبا لەوانە بوو شتهایەکی کە سەروکاری بە ژیانییەوە هەن، کردبا.» بەش بە حالی دلپاکیی ژنەکە هیچی پێ نەبوو بیلێ. سێیەمیان کابرایەک بوو کە سەری بە دەرد و مەینەتیی منداڵ و ناساغییەوە گێژ ببوو: «ئامۆژگاریی ئەوەی دەکەم کە زۆر ئاگای لە تەندروستیی خۆی بێ، ئەویش «باشە، دوکتۆر» دەڵێ». کەچی جاکلین دە کاتێکدا کە چارەمیان دوکتۆرێ بووە و نەخۆش دەکەوت، هیچی گوێ

نەدەدایە، دەگەڵ پێنجەمیاندا زۆر جیاواز بوو، خۆ ڕەنگ نەبوو کۆخەیەکی لێوە بێ، هەر یەکسەر بۆی نارەحەت دەبوو: «ئێرە کارگە نییە،» دەیگوت. جاکلین ئەو نیو سەعاتەی کە هەموو ڕۆژێ پێش دەست لە کار هەڵگرتن ئیزنی دەدا، وەگەڕێتە ماڵێ، بە بەختەوەرترین ڕۆژگاری ژیانی وەبیردێتەوە.

بە لانی کەمەوە بڕێ لەوانەی کە کاریان داوەتێ بە هاوڕێی خۆیانی دەزانی بە یەک لەوانەی ئەوها گوتبوو: «چدەبێ با ببێ، بە جێتان نایەڵم، ناتوانم ئەوە نەدرکێنم کە جارێکی دیکە یەکەکی دڵچاکی وەک ئەنگۆم لێ هەڵناکەوێتەوە.» وێڕای لایەنە سەلبییەکانی دوکتۆر (٢٤) ساڵی خشتی دە خزمەتدا پڕکردبوونەوە؛ «چونکە باشی دەناسم، دەزانم کووی دەگەڵدا هەڵدەکەم. هەر کاتێکی بزانم لەسەر بەرنەکسیی خۆی دەڕوا، ورتەی دەگەڵ ناکەم.» ئەسڵەن کێشەکان لەوەڕا دەست پێ دەکەن کە لە کارەکان بەگازن و دەم بە هاوارین. «خاوەن ماڵی ژێر و ئالوسال لە پێش میوانان لەسەر هەڵەیەکی چکۆلە ڕاناسێ و نایکاتە هەرا، کارەکە لە متبەقێ چارسەر دەکا. هەشە، وا نییە، دەم بە هاوار و ناشقە شاتە شات و هات و هاوارە.» جارێکیان جاکلین لە زیافەتێکدا دانانی پەتاتەکانی بەڕیز لە چاردەوری گۆشتی لەبیردەچێ، لە قاپێکی دیکەیاندا دادەنێ. خانمی ماڵێ پێی دەڵێ «مێشک بۆقلەموونی» جاکلین گەرووی پڕ لە گریانێ دەبێ، دەڵێ: «دەست لە کار هەڵدەگرم.» دوکتۆر عوزری بۆ دێنێتەوە، بەڵام خانمەکەی هەر خۆشی تێ ناگەیەنێ. جاکلین دەمێنێتەوە. لە ماڵێکی دیکە بە پاکار و قەرەواشی نێو دەبەن: «بەم جۆرە نێوهێنان و باس کردنەمم بۆ قووت ناچێ»، بەڵام پاشان توورەییەکەی خاو دەبێتەوە: «مرۆ دەبێ فێری بە هەر هەموو بارێ ڕاهاتن ببێ. هەر خاوەن کارێ دەگری، کەموکوڕییەکی خۆی هەیە. هەیە لە مانای پاکاری ماڵان بگا یان نەگا.» ئیدی جاکلین بەم جۆرە دڵی خۆی دەدایەوە: «ئەم ئینسانانە متمانەم پێ دەکەن. دە خزمەت ئەمانەدا سەواد و ڕۆشنبیریم زیاددەکا، دنیایێ چتم فێردەکەن. یەکیان –

پیاوێکی زۆر ڕۆشنبیره - دەردەدڵی خۆیم بۆ هەڵدەڕێژێ و لە یەکبینەش، بەینی خۆمان بێ، دڵێ ئامۆژگاریم دەکا.» ئەم جۆرە ڕێکەوتانە کە ژیان و گوزەرانی جاکلین ڕوون دەکەنەوە، بەم ئەندازەیە لە تەنکاو یان ڕۆتینانەدا زێتری لە بیر و ئەندێشەدا ئالوویرکردبا، لەو بیر و ئەندێشانەی کە دەهاتنە ئاراوە مرۆڤانەتر بان، لەوانە بوو ئەم ژیان و گوزەرانەی وی بە جۆرێکی دیکە با، ئەگینا ئەم بەرتەسک کردنەوەی بیر و ئەندێشانە لەنێوان خاوەن کارەکان و کارەکەر و کرێکاراندا - بگرە لە نێوان برێ خەڵکیشدا کە پێکەوە دەژین - واتە: سنوور و بواری وەی کە چ دەگەڵ یەکدیدا بڵێن یان نەڵێن، چتێکە لە بەروبووی خەیالات... مەبەستم ئەوەیە مرۆڤ خۆی بۆ خۆی کۆت و زنجیر بە خەیاڵ دە ملی خۆی دەکا. لە «لێهاتوویی و کارامەیی»ی جاکلین بنواری ئێستاکانیش لەسەر ئەوە سوورە کە تاکە کارێکی بە درێژایی ژیانی - ئەگەر بە دەستە خۆی با - پەسندی کردبا، خزمەتی پیر و کەنەفتان بوو، بەلام چبکا، ڕووی بێ شادەنامەیی ڕەش بێ... لایەنی هەرە تراژیکی کارەکە لەوەدایە کە جاکلین سەرنەکەوتنی خۆی دە هەر کارێکدا کە لە خزمەت کەسانی دەسەلاتدارانیدای ئەنجام داوە، بۆ وە دەباتەوە کە دەسەلاتدارەکە هەمیشە بەرەکەی بە لای بەرژەوەندیی خۆیدا ڕاکێشاوە.

خوێنەدەی بەڕێز، ئەم چیرۆکە دەشێ بە لە یەک دوو ڕێگا زێتر لێک بدرێتەوە. دەتوانین بڵێین: ئیدی ژیان چتێکە لەم قوماشە.. لە بۆ بەو جۆرە بوونەشی سەت و یەک سۆنگەی هەن. یان بڵێین، ئەگەر مرۆڤ بیەوێ ئەو کۆت و زنجیرانەی کە دەملی خۆی ئالاندوون، داماڵێ، ئەو دامودەزگا لە نەقڵ و ئاوەزیەدەرانەی کۆمەڵ بە بارێکی ئاقلانەتردا بەرێ و بە ئەنجامدانی ئەم کارە، بە ئومێدی پایدۆست بە هەژاری و برسێتی بدرێ، ئێسکی ژیان نەختێ سووکتر کا، ڕەنگە ئەم کارە دەیان، بگرە سەتان ساڵی گەرەک بێ و وەک مەتەڵی شیردا بۆ داپیرداکەی لێ بێ. یان بڵێین: بابە، پیاو نابێ هێندە بە تەنگ دنیاوە بێ و چش لە مەینەتیی ژیان و بۆ

ئەوەی بتوانێ سا هەر چۆنێ بێ بیگوزەرێنێ و وەبەر گاڵتەجاڕی و باری خەیاڵپڵاویدا، یان شەو و ڕۆژ مەراقی باوێتە سەر ئەو پێناسە و تاریفانەی کە زۆر بە قووڵییەوەیان بۆ ژیان کردووە، ئەوجا کە ئەوانەشی کرد، هەرچی پێشنیهادێ کە بۆ چارەسەری ناماقووڵییەکان هەیە سەرلەبەری، وەک ماڵی قەڵب بەسەر ساحێبیانیدا بداتەوە و هەرچی هەڵپە و تەقەلای بێهوودە هەیە و نییە، بە گیزەی مەگەز بە هیچ بزانێ و دەتوانێ بەمە خۆی لە شەوارەیی خەمۆکی و نائومێدی قوتار بکا. ئەمن مەبەستم جیاوازە. ئەمن لە پشت بێ یەغبالییەکانی جاکلینەوە، سەرلەبەری ئەو ئینسانانەی کە وێڕای وەی ژیانێکیان بەسەر بردووە، خۆیان بە هیچ لەقەڵەم دەدەن، یان ئەوانەی کە ڕەفتارێکی ئەوهایان لە کەسانی دیکە دیتووە، بە چاوی خۆم دەبینم. قورسترین هەستوخوستی سەرنەکەوتن و بەزینی ئەم جۆرە ئینسانانە، لەوەڕا چەکەرەی کردووە کە قەناعەتیان وایە ئەسڵەن هەر نەژیاون، وەک مرۆڤێکی سەربەخۆ و ئازادیان ئەنۆڕدراوەتێ، هەرگیز گوێیان نەدراوەتێ، قەت جارێکیان لە بیروبۆچوونیان پرسیار نەکراوە، هەر وەک کالایەک چۆن لە بازاڕ سەودای بۆ دەکرێ، بایی چەندە و چەند نییە؟ بەو جۆرەیان نرخ لێ نراون. حاڵی کۆیلەکانیش بە گشتی هەر بەو جۆرە بوو. ئێمە هەموومان لە بەرەی کۆیلەکان - یان بە کۆیلە لەقەڵەم دراوەکانەوە هاتووین. ئەگەر کرابا، پاشەوپاش بەرەو ڕابردووی خۆ وەگەڕابایین، کارەکە لەوێڕا دەستی پێ دەکرد کە باپیرانمان چۆن چۆنی کەم تا زۆر، بە کۆیلە کراون و تا چ ئەندازەیەکمان لەم کۆیلەتییە بۆ بە میراتی ماوەتەوە. وێڕای وەی کە کۆیلەتی بە یاسا لە ئارادا نەماوە (کۆیلەتی لە عەرەبستانی سوعوودی لە ١٩٦٢دا بەتاڵکراوەتەوە) و مانایەکی بەداوێنی مەجازییانەی هەیە: لەوانەیە بەبێ ئەوەی بە خۆمان بزانین کۆیلەی چڵێسی و حیرس و تەماح و کار و پلە و پایە و خوو و خدە، یان لەبەر زۆر سەوەو و سۆنگە لە هەموو کەسێ زێتر کۆیلەی ژنەکانمان بین.

دنیا هێشتا، با ئاغایەکانیان نێویشیان لێ نەنرابن، پڕە لەو ئینسانانە

که سەربەخۆییەکان کلک و گوێ دەکەن و هەموو چتێ لە نیگای ئەو هێزە ئابووری و کۆمەڵایەتییە بابەت ئانۆنیمە لە کۆنترۆڵ بەدەرەوە یان لە ژێر کاریگەریی ئەو هەلومەرجانەدا کە ئابلوقەی داون یان لە نیگای خۆ و ئینسانی ئەو گەوجییانەوە کە لێیانەوە بیردەکەنەوە. یان چاوچنۆکی و تەماحیان بە جارێ هەموو چتێکی ئینسانانەی پێ لە بار بردوون و بە جارێ کوێر بوونەتەوە، تەنانەت وەک گوناهبارێکی درێژەی باپیرە گەورە کۆیلەکەی هێندەی تروسکەیێ ئومێد پێ نەماوە؛ خۆ دەشکرێ لەو گوناهانەی کراون ڕوو لە پەشیمانی بکرێ، کەچی ئینسانی بێ دەسەڵات و دە قــوژبنێکدا تەنگەتاوکــراو، لە بەخت ســواریی ئەم چارەســەرە سەرپێییانەش بێ بەهرەیە. جاکلینەکان، عەیشێیەکان، فاتیەکان و تاد... کۆیلە نین. بێ کەسن. جاکلین دیل نییە. کەس مافی ئەوەی نییە دەست لە بەری ڕەنجی جاکلین وەردا، بەڵام ئەتۆ وەرەوە سەروکاری مرۆڤێ کە ژیانی خۆی بە کۆتایی هاتوو یان بە بێهوودە و هیچ دەزانێ، ئەمە تا ئێستاش لە ژێر باری ئەو ئانومێدییەدا، کە چنگوڕکی لێ گیرکردبوو و پێی وابوو کاروباری دنیا بە بێ کۆیلە بەڕێوەناچێ و دنیا هەر وا بووە و هەر واش دەبێ، دەتلێتەوە. لەبەر هەندێ، دەبێ بزانین کۆیلەتی لە ڕابردوودا بەرابەر بە چ بوو؟ پەی بەمەبردن چتێکی زۆر گرنگە. مرۆڤەکان لە ڕابردوودا لەبەر سێ هۆکــاری بنەڕەت تووشی بە کــۆیلە بوون هاتن: یەکەمیان، ترس بوو. ژیان هەرچەندە پڕ لە ئێش و ئازار و ئەشکەنجە بێ، ئینســانەکان مردنیان نەدەویست؛ لەبەر ئەوە، ئەوانەی کە مردنیــان لە جەنگەی شەڕێدا بە گەورەترین شەرەف و شانازی دەزانی، هەر کە بە لێواری مردن گەیشتن، بەوە قایبل نەبوون کە لە لایەن پادشا و نەجیوزادە و میر و گزیر و گرەگری خاوەن زەبروزەنگەکانی دیکەوە کە بە کۆیلەکردن و کەوی کردنی ئاژەڵیان وەک یەک چت لەقەڵەم دەدا، بە چاوێکی کەمیان تەماشابکرێن. کۆیلەکان لە پێشان لە وەکو ئاژەڵ ڕەفتار دەگەڵ کردن، کڕان و فرۆشران، کاسەسەر هەڵکۆڵین، بە داخ کردنی هەنیە و نێوچاوان

نیشـانه کردن، ئاڵقـه له گوێ و کەپوو کـردن، دەسبێنک و بازنی ئاسن له مەچەک کردن، زنجیـر له مل کردن و پاوەنه له پێ و نک کردن و لێدان و قەیارکردن و به نێو و ناتۆره لێ کەم کردنەوەی وەک مـەیمون، مەحزوون، ڕووسپی و زۆری لەم جۆره بابەتانەی دیکه که له سیاحەتـنامەکەی ئەولیا چەلەبیـدا، بخوێنیـیەوه، زۆرت لێ بەرچاودەکەون، نێوبران، چاوپۆشییـان کـرد؛ چونکه زوڵـم و زۆر لێ کـردن بۆ بەشـێکی گـەورەی مـرۆڤـایەتی، به سرشـتێکی ناچاریی ژیان لەقەڵەم دەدرا. له سەروبەندی «هان»دا، له چین و ماچین ئەو واژەیەی که به مانای «کۆیله» دەکاردەبرا له واژەی «زارۆک» یان «ژن و زارۆک» کەوتبۆوه. ئەم مۆدێله بێ سوال و جواو مل کەچ کردن و گوێ به فەرمانیـیه، له بەشێکی گەورەی دنیادا، بەسەر زۆربەی چەوسـاوانی هاڕدراوی مرۆڤـایەتیـدا، کـۆیله بن. کـۆیله نەبن، به ڕەسـمی داسـەپابوو. پێش ئەوەی (١٢) ملیـۆن ئەفـریقـایی بۆ کـۆیلەتیی دنیـای نوێ، ڕاڕفێندرێن، ئەو قوربانیـیه سەرەکییانەی که بۆ یەکەم جار نێوی ناماره‌کی کۆیلەیان لێ نرا، سـلاویـیەکان بوون. ئەو سلاوییانەی که له لایەن ڕۆمایی و مەسـیحییەکان و سورمانەکان و فایکینگەکان و تەتەرەکانەوه ڕاودەکران، بۆ کڕین و فرۆشتنی سەرانسـەری دنیـاێ دەنێردران، به دەم ڕۆژگارەوه، واژەی سـلاو به مـانای بیـانی دەسـتی به دەکـاربردن کـرد. بەشی هەره گـەورەی ئایینەکان ڕێگەی مرۆڤ به کۆیله کردنی دەدا، ئیـدی بەم جۆره ئەو منداڵه بەریتـانیـاییـانەی (کچەکان لەبەر وەی پوولی زێتریان دەکرد، چاتر قەڵەو دەکـران) کـه به کـۆیلەتی بۆ بازاڕەکـانی دەرێ دەنێـردران، بوون به سـلاو. هێندێ لەو سـلاوانەی کـه له سـەروبەندێکی نزیکتـردا، خـۆیان دەبن باندووری فەرمانفەرمایی کەشیشه کەڵەگا هەر خۆحسێوەکاندا دیتنەوه و تروسکەی ئازادبوونیـان له هیچ درز و کـەلێنێکەوه بەدی نەدەکـرد، ئەو قـەناعـەتەیان ده مـێشـکیـدا بۆ پەیدابوو، کـه هەر به خـۆڕسـک چـتـێکی تایبـەتیـان تێدایه، بۆیەکا به کـۆیله دەبن. هەسـتی خۆ به کـەمزانین له کـوردەواریدا زۆر جـاری دیکەم باس کـردووه، وای کـردووه، هێندێ جـار

تەماح وەبەر دژمنانی بدا، لەسەر زمانی کوردەکە خۆی، قسەی وەک: (kurtten pasa soyutten masa olmaz)، یان «الکرد والجرذ والجراد» یان تاد... بە دوو بخەن. ڕاستیت گەرەکە ئەمە ئەنجامگرییەکی مەنتیقیی سەقەتە؛ چونکە لەو تێنوارییەوە ئاودەخواتەوە کە چتهایەکن بوون بە ڕاستی و کێشەیان لەسەر نییە و وەک چارەنووسێکی لە خوایشت و ئیرادەی مرۆڤ بەدەر لەقەڵەم دەدا. ئەسڵەن ئەم جۆرە بیرکردنەوە هەرزەیە کە هیچ مرۆڤێکی ئازاد، ئەقڵی ناپیرێ و ئەوەی پێی وایە ئەمەش بۆ نائومێدی بە کۆیلە قەبووڵاندن جۆرە ئەقڵ بەکارهێنانێکە، ناماقووڵیی فەرمووە.

ترس لە هەموو کاتێکدا لە واز و ئارەزوو و حیرس و خۆبەخت کردن بەهێزتر بووە. ئینسانەکان بە ئازادی لە دایک نەدەبوون. تەنها ئیمپراتۆری بیزانس، ماوریکیۆس (٥٨٢ - ٦٠٢) ئەم هەڵاوێردە (استثنا)ەی هەڵێنابوو. سێ کەس لە سڵاوەکان کە دەردەستی کردبوون، تووشی سەرەخولێ و سەرسوڕمانیان کردبوو.. ئەم پیاوانە کە لە جیاتیی چەک «گیتار و زێتەر»یان هەڵگرتبوو. ئەمانە بە چیا و چۆڵ و زۆزانانەوە دەگەڕان، ستران و حەیران و لاوژەگەلێکیان دەچڕی کە باسی ئازادی و سەربەخۆییان دەکرد. بە ئیمپراتۆریان گوتبوو: «کەسانێ کە ئاشنایەتییان دەگەڵ شەڕوشۆڕدا نییە بە ئەشقەوە خوو دەدەنە موزیک و کاریان هەر ئەوەیە و ئەمەش کارێکی زۆر سروشتییە». بابەتی سترانەکانیان ویست و ئیرادەی سەربەخۆیی و بە خاوەن ویست و سەربەخۆیی نامێ بوون، دەناسران. تا ساڵانی (١٧٠٠)یش تووشی ئەم جۆرە ئینسانانە دەهاتی، تا حەزرەتی پەترۆسی گەورە فەرمانی تووش نەهاتنیانی فەرموو، هەر مابوون و سترانی خۆیان دەچڕی. هەرکەسە، دەبوو بە یاسا و ڕێسا سەر بە چینێ بێ و ئەو چینەش دەبوو کارێکی کە بۆی دەسنیشان کرابوو، ڕاپەڕێنێ. هەروەها پاش سەت و پەنجا ساڵێ تارا سێوچینکۆی ئۆکرانیایی بەدیل گیراو، پاشان ئازادکراویش هەر ئەم سترانانەی چڕیوە کە لەسەر ئەم

داوودوستووره ڕۆیشتووه، «سەت حەیف و مخابن بۆ بە دەست قەیسەری عەبیاش خەفەکرانی ئازادیی دەکێشا.» و لەسەر ئەوە کە دەبێ لە نێو سروشتدا بە چار چاوەوە لە ئومێد بگەڕێی:

**گوێدێرە، گوێدێرە چەڵێن،**
**لەو کێوە ڕەشانە بپرسە.**

لایەنی هەرە سەرسوڕهێن لە دیرۆکی کۆیلەتیدا ئەوەیە کە وەک ڕۆبۆت ژیان بەسەربردنیان بۆ خۆیان هەڵبژاردووە. ئەمن پێم وایە هەر ئەو بە -ro bot بوونە بوو کە زێتر خەڵکی رووسیای لە ڕژێمی سۆسیالیزم تۆراند. ئەمن پێم وایە ئەوانەی بۆ پایدۆس بە کۆیلەتی دران، هەوڵیان داوە، با گوێ لەم قسەیەی پۆبلیلۆسی هونەرمەندی شانۆ و بێ قسە (Pandomima) کە لە بنەچەکەدا کابرایەکی کۆیلەی سووریایی بوو لە ڕۆمای کۆن بگرین کە دەیگۆ: «خاڵی هەرە لووتکەی کوڵۆڵی ئەوەیە، کە بە ویست و ئیرادەی کەسێکی دیکەوە، بەسترابی.» کەچی فەنتازیایەکانی ئەشقی ڕۆمانتیک لەسەر بنەمای پێوەندایەتی دامەزراون. بەشی زۆری کۆیلەی ئازادکراوی دنیایێ بە کۆیلەتی مانەوەیان پەسند کردووە و لەسەر کارێکی کە کردوویانە و درێژەیان پێداوە، کۆیلەتییەکەیان پێ خۆشتر بووە. سرانەوەی لەکەی کۆیلەتی لەنێو چاوانی مرۆڤ چەندین بەرەو ئەسلی بەسەردا تێپەڕین و لە چین و ئەفریقا کۆیلە ئازادکراوەکان ناچار خراونەتە چوارچێوەی ستاتووی کەسوکاری هەژارەکانیانەوە. لە ئەورووپا بوون بە وەرزێر و فەلا. بە بێ پارێزگاریی یەکێکی دیکەی دەسەڵاتدار، ژیان ماجەراجۆییەکی فرە ترسناک بوو. تایبەتمەندێتیی هەرە سەرسوڕهێنی کۆیلەکان - جگە لەوانە کە بۆ لە بیرەخۆ بردنەوەی ئێش و ئازارەکانیان هەمیشە بە مەستی و سەرخۆشی دەخولێنەوە - ئەوەیە کە لە پێناوی پاراستنی ئابروو و شەرەفی خۆیاندا زۆر کارامە و سەرکەوتوو بوون. زوربەی زۆریان، وێڕای وەی کە خوێڕووترین و پەستترین کاریان دەکرد، لە

پاراستنی خودموختاریی خۆیاندا زۆر لێوەشاوە و باڵادەست بوون.

بە ڕواڵەت وا بەدیاردەکەوێ کە بە چاوی خوار تێ نواڕین و تەوهین کرانیان بۆ قووت دەچێ و وێڕای وەی کە ئاغایەکانیان بە کۆیلەیان دەزانن، کەچی ئەوانیش دەزانن دەوری خۆیان لەوەدا کە چەند ئاغان و چەند ئاغا نین، بگێڕن. «ڕاوکەری ئاقڵ ئەوەیە کە دەوری گێل بگێڕێ.» ئەمە یەکێ لە پەندە پێشینانەکانی هەرە پەسندی کۆیلە جامایکاییەکان بوو. ئاو بە ئاو کۆیلەدار تەنیا خۆ بەفریودانەوە نەدەوەستا، بگرە هەشبوو، هەریەکە خۆی بە کۆیلەیەک لەقەڵەم دەدا. پلینیۆسی زۆرهان لە (٧٠ی پ. ز.)دا ئەمانەی نووسیبوو: «بۆ چوونە کوڵان لاقی غەیری خۆمان، بۆ نواڕینە دەوروبەری خۆمان چاوی غەیری خۆمان، بۆ سڵاو لە خەڵک کردن بیری غەیری خۆمان بەکاردەهێنین، بۆ لە ژیاندا مانمان پێویستیمان بە غەیری خۆمان هەیە - تەنها چتێکی کە بۆ خۆمانمان هەڵگرتووە و بەکاریان ناهێنین، واز و ئارەزووەکانمانە.» ئەم کۆیلەدارە ڕۆماییە کە کتێبێکی هێژای لەمەڕ خۆڕسک ناسی ئامادەکردووە، بە هۆی لە کاتی گرگرتنی گرکانی ڤیزۆڤ زۆر نزیک کەوتنەوەیدا، مردووە. بلینۆس بۆ خۆی دەیزانی چتۆ توفەیلییەکە؛ چونکە پێی وابوو وردبوونەوە لە توفەیلییەکانی خۆڕسک باشترین ڕێگایە.

کۆیلەتی یاساغ و قەدەغەکردن، بەدبەختییەکە چارەسەر ناکا، یان بەلای کەمەوە چارەسەرێکی ڕاستەقانی نەبوو؛ چونکە لە ژێر زۆر نێوی دیکەدا جۆری تازە بابەت دادەهێندرێن. کرێکارانی کارگە و فابریقەکان کە هەر لە سبیانێرا تا ئێوارە هەوای ژەهراوییان هەڵدەمژی و جوانیاویان دەردەدا، ڕۆژی یەک شەموانی لێ بترازێ، تیشکی ڕۆژیان نەدەدیت و بێ سرتە و ورتە بەرگەی ئەو مەینەتییەیان دەگرت، لە کۆیلەکانی دیکە زۆر خراتر دەژیان. بەش بە حاڵی سەرلەبەری ئەوانەی کە گوێ بە فەرمانی خۆیانن نەک بەرپرسی بڕیارەکانی خۆیان و بگرە سێیەکی خەڵکی بەریتانیا بە گوێرەی کۆنترۆڵێکی ڕای گشتی، لە میراتگرە مەعنەوییەکانی کۆیلە

موتەتەوویعەکانی رووسیان. دەبێ ئەوە لەبیرنەکەین کە سەربەخۆیی کارێکی قورس و گرانە. لەو دەمەدا کە مرۆڤ برستی لێ دەبڕێ و توانستی نامێنێ، جا خودای دەکرد هەزاران پەسن و ستایشنامەی بە شان و باڵادا بڕێسرێ، ئەشقی سەربەخۆیی هەمیشە ڕووی لە کزهەڵاتن و ساردوسڕ بوونەوە کردووە.

ئەنجامێکی کە من بۆ خۆم لە دیرۆکی کۆیلەتیم هەڵێنجاوە، ئەوەیە کە سەربەخۆیی بەش بەوەندەی کە دەگەڵ مافەکاندا سەروکارە مەسەلەیەک نییە بە یاسا و ڕێسا بتواندرێ دەستەبەر بکرێ. بڵێین وا سەربەخۆیی ڕادەربڕینیان دان، لەسەر هەر چتێ بڕیاردان، دیتنەوەی یەکێ گوێتان لێ ڕاگرێ، قسەکانتان لە گوێی گوێگران خۆش بێن، ئەمانە هەموو دەکەونە ئەستۆی خۆتان و سەروبەرنانی ئەمانەش کارامەیی و جەربەزەیی گەرەکە. ئەوەی یاسا و ڕێسا بۆمانی دەکا، هەیە و نییە، تەنێ ڕێگای تەمبوورەلێدانمان دەدا، ئەوجا تەمبوورە هەیە، نییە و چۆنی پەیدادەکەن، ئەوە لە ئەستۆی خۆتانە. دڵمان بەوە کە مافەکانی مرۆڤ مانیفێستۆ و بەیاننامەیان بۆ دەرچووە خۆشە، بەڵام دەبێ ئەوە بزانین کە ئەمە نامیانی بەشێکی چکۆلەی سەربەخۆییە.

جا لەم ڕووەوە، کاتێ باسی سەربەخۆیی دێتە ئاراوە، هەر وەک بە گشتی دەکرێ، بەندە تاکە کەسێ کە لە جیاتیی وەی فەلسەفەی یۆنانی کۆن کورت کاتەوە، بێ لە ژیانی ئینسانانێکی فرە سەرڕاست و هەلومەرجی ڕاستەقانی بکۆڵێتەوە و یەکێ لەوانە بە دەسکەلا بگرێ و لەسەری بدوێ، پەسنددەکەم.

ناتــــــــزرە El Greco ی (Domenikos Theotokopulos) (١٥٤١ - ١٦١٤) دەگەڵ کەسانی دیکەدا هاوسەروساختی پەیدا نەکردبا و فێرە ئەوە نەبا مرۆڤایەتیی ئەو کەسانەی کە وا پێدەچوو بەشی خۆیان لە مرۆڤایەتی دەردست نەکردبوو، ئاشکرا نەکردبا، بێ گومان هەروەک هونەرمەندێکی چەپەک و بنگۆمکەوتە دەمایەوە و قاڵبگرتە و هیشک

هەلاتووی نێو قەپێلکی قایدە و چتی خواسایی کە هەمیشە هەر سەرگەرمی نۆیقوونە دروستکردن بێ ، هیچی تێدا بەست نەدەبوو. Gre-El co پاش ئەوەی سەرلەبەری دابونەریتی کەلەپوور خرکردنەوەی ولاتەکەی خۆی کە گریت بوو ، هەلمژیبوو (ئەو گرداوەی کە لە ژێر فەرمانڕەوایی ڤینیسیاییەکاندا بوو ، خەلکەکەی بوون بە دوو بەشەوە: ئەرتۆدۆکس و کاتۆلیک و لە سای ئەو پەنابەرانەی کە هونەری بیزانسی لە گیانەلادایان بەرەو دوارۆژ رادەگوێزت، لەگەل رابردوودا وەک کەروخۆلەمێش وابوو) لە ولاتەکەی خۆی وەدەرکەوت و بریاری دا رەهەندی نوێ - نوێ بە کەلەپووری لەمێژینەی ببەخشێ. بە هۆی نیگارکێشێکی کرواتیی Jalio Glovio ناوێکی بە (مەکەدۆنیایی) ناسراوی زۆر نامێوە، بوو بە قوتابیی Tiziano. لەم قۆناغەدا چیی لێ داوادەکرا، هەر ئەوەی دەکرد و لە نیگارکێشێکی بە زەوق و مجێزی ئیتالیاییانە بمولاوە چیدیکە نەبوو، بەلام بریاری ئەوەی دابوو کە لە هونەرمەندێکی لاسایکەرەوەوە بەرەو سەرووتر هەلکشێ. لەبەر ئەوە هێشتا تەمەنی سی و پێنج سال بوو، لە تۆلیدۆ گیرسایەوە. کە لە سۆنگەی ئەمەیان لێ دەپرسی، دەیگۆ: «مەجبوور نیم وەلامی ئەم پرسیارە بدەمەوە.» بەلام لە هەمان کاتدا El Greco دادگاییی هەزاران کەسی بێ گوناهی لە دادگایەکانی بیروباوەڕ پشکنیندا بە تۆمەتی لە ئایین لادان، بە چاوی خۆی دیت. لێرە لە گەڕەکی کۆنی جووەکاندا، ناوبەناو بە ئاشکرا، هێندێ جار بە نهێنیی لەگەل ئیسانانی بیروباوەڕ جوداوازدا هاوسەروساخت بوو. هەولی ئەوەی دەدا کەسانێکی لێکدی ناتەبا و ناکۆک ئاشت کاتەوە. El Greco لەو بڕوایەدا بوو کە نیگار پارچەیەکە لەو رێگایەی کە بۆ زانست، بۆ زێتر لە مرۆڤ گەیشتن دەڕوا.

یەکەم هۆکاری پەیدابوونی کۆیلەتی ئەوە بووە کە ئەوانەی ویستوویانە دە حالی خۆیاندا بمێننەوە، لەوەدا سەرنەکەوتوون کە وەسەر رێگای ئەوانەی چێژیان لە دلڕەقی دەگەل کردن وەرگرتووە، بکەون. ئەوانەی زۆرەملێ و

دڵڕەقییان بڵاوکردۆتەوە، لە سای بە بزاوت ئێخستنی ئەو ترسەی کە هەر کەسە دەگەڵە خۆی بە میراتی هێناویتی، دە بەشێکی گەورەی مێژوودا زاڵ بوون و سەرکەوتوون.

هۆکاری دووەم مرۆڤەکان هەر وا بە خوایشتی خۆ و لە خۆڕایی کۆیلەتییان قوبووڵ کردووە. بەشی هەرە گەورەی کۆیلەکانی مەکسیکای نازتێک کەسانێکن کە لە ژێر وشاری خواستی خۆ لە بەرپرسی دزینەوەدا، قەکەم لە جێی خۆی بێ، کۆیلەتییان «هەڵبژاردووە»، بە نموونە ئەو وەرزشوانە کۆنانەی کە بە بۆنەی دەگەڵ تۆپانەی نەتەوایەتی (patolli)دا هاوسەروکارییانەوە هەر چییەکیان هەبووە و نەبووە لەدەست داون، یان ئەو ژنانەی کە لە ئاشقێتی و ئەشقبازی ماندوو و بێزار بوون و هەر بۆ ئەوەی ژەمە خواردنێ دەسەبەرکەن، کۆیلەتییان قوبووڵکردووە و کۆیلەتی لسەر بنەڕەتی ئەو رێککەوتنە دامەزراوە کە کۆیلەکە تێر بکرێ، یان ئەگەر تێرنەکرا، ئازاد بکرێ. خەڵکی کۆنی مەسکەویەوە کە پاش ئەوەی ڕاوچییەکانی خۆیان فێرە خۆراگری و دوای ئەوە دەست بە کۆیلەکردنی یەکدی کردن دەکردن، هەشت جۆرە هەرە لەباو و بڵاوی کۆیلەتیی جودا جودایان کە «داوتەڵب» (متطوع)ەکان دەسەبەریان دەکرد، تەشەنە پێ کردووە. لە کۆمەڵی نوێی مەسکەویەکاندا دامودەزگای سەبیلخانە و خێرخوازی نەبوو. ئەدارا و دەستکورتان خۆیان دەفرۆشت و دەبوون بە کۆیلە. ترازووی کۆیلەتی لە نێوان سەتەی (١٥ و ١٨)هەمدا لە کۆمەڵی مەسکەودا گەیشتبووە یەک لە دە (لەبەر ئەوە ژمارەی کۆیلان لە ژمارەی خەڵکی شار و سەرباز و ڕەبەنانەکان سەرووتر چووبوو).

کۆیلەتی لە ڕووسیا، بەش بە حاڵی ئەوانەی کە جگە لە خۆفرۆتن هیچ چێتێکی دیکەیان نەبوو، وەک دووکانی سووخۆرێ کاری دەکرد. بە گشتی، سێیەکی کۆیلەکان ئەو قاچاخانە پێکیان دەهێنا کە خۆیان شاردبۆوە، بەڵام زۆربەی زۆری ئەوانەی لە سەربەخۆیی وەڕەز ببوون و لە ئەقڵییەتی زیندانی قوتار نەببوون، وەدەگەڕانە سەر ژیانی کۆیلەتی. بە پێی بیروبۆچوونی

Hellie هەموو کۆیلەیێ بیر لە سەربەخۆیی ناکاتەوە، خەیاڵی ئازادبوون بنیات نانێ، لەپاش ڕابووراندنی چەند ساڵێ بە مەینەتی و ئەوپەڕی هەموو ئازادییەک لێ قەدەغەکرانێ، هەست بە بوونی ئازادانە، بەرە - بەرە وای لێ دێ کە وەک چتێکی مەحاڵ دێتە ئەقڵەوە. هەلاتن، لە ئەمەریکا کارێکی سەختتر بوو: دە کاتێکدا لە ڕووسیا و چین و ماچین کۆیلەکان بەگشتی لە کاری نێومالدا بەکاردەهێندران، کەچی لەبەر زۆروزەوەندەیی کۆیلە لە ئەمریکای باشوور بەوپەڕی دەلڕەقی و ناجوامێرانەوە لە کێڵگە و مەزرایەکاندا بەکاردەهێندران، بەلام پەیدابوونی ئەم هەموو جۆر و تەرزە زۆر و زەوەندەیەی کۆیلەتی، جا بارودۆخی تایبەتیی هەریەکە بۆ خۆی چۆن بووبێ چۆن نەبووبێ، ڕێی بۆ ئەوە خۆش دەکرد کە ئەمیان دەگەڵ ئەوی دیاندا لە ئازارچەشتن و مەینەتی کێشاندا هەست بە فەرقێ بکا و بتوانێ کەمێ خۆی ڕاپسکێنێ و هەر یەکە بەش بە حاڵی خۆی بیر لەوە بکاتەوە کە دەگەڵ یەکی دیکەیاندا فەرقێکی هەیە و خۆی لە جۆری هەرە ژێرەوەترەکان لەقەڵەم نادا. ئێرەیی و حەسادەت دە بەرابەر ئازارچەشتنی هاوبەشدا چاوانی کوێر دەکرد: لە کێڵگە و مەزرایەکانی ئەمریکاییەکاندا هەر بە ئاشکرا، کۆیلە ئەفریقاییەکان، کۆیلە ئەفریقاییەکانی دیکەیان وەبەر تازیانە و قامچی دەدان. خاستری بێژم، دەزگایەک کە پاش وەی دادەمەزرا، ئەوانەی تەنانەت کە زیانیانیشیان، وردە - وردە ڕێگای مسۆگەرکردنی وردە - وردە قازانجییەکیان دەدیتەوە و بتەوێ و نەتەوێ، بۆ بە پێوە ڕاوەستانی ئەو دەزگایە، کۆمەگیان پێشکێش دەکرد.

نموونەی سێیەمی کۆیلەتی، بابوباپیرانی حوکمڕانان و بیرۆکراتانی ئەوڕۆمانیان پێکدەهێنا. بە خاوەن کۆیلە بوون ئاو و دەبدەبەی پەیدا دەکرد، هەرچی بە کۆیلە بوون بوو، واتە: کارکردن و ڕەنجدان. کار لەبۆ یەکێکی دیکە کردن، حاڵێک بوو شیاوی ئازادەکان نەبوو. ئەریستۆکراتە ڕۆماییەکان، بە ناوی بیرۆکراتانەوە دە خزمەت ئیمپراتۆرەکاندا کارکردنیان ڕەت کردەوە. ئیدی لەسەر ئەمە، ئیمپراتۆر دەزگایەکی خزمەتی سیویلی لە

کۆیلەکان پێکهێنا. ئەریستۆکراتەکانیش بەڕێوەبردنی کاروباری مڵکەکانیان بەرەورووی کۆیلەکان کردەوە. کۆیلەکان خێزانیان دانەدەمەزراند، لە کۆیلەدارە ئاغایەکانیان بەولاوە سەروکاریان بە کەسی دیکەوە نەبوو. کارمەندانی هەرە بە متمانە و سەرباز و سکرتێرە تایبەتییەکان، ئەوان بوون. کارمەندایەتی و وەزیفە بینین لە ئیمپراتۆرییەتەکانی عوسمانی و چین و ماچیندا بەرچاوکەتن، دیاردەیەکی زۆر خواسایی بوو. نممانە ناو بە ناو دەیانتوانی بە خزمەتکار و پاکاریش بن. ئەندامانی ئەو خێزانەی کە جێی متمانەی دەوڵەت بوون، بە پلە و پایەی زۆر گرینگ، تەنانەت تا پلە و پایەی سەرەک وەزیری و ئیمپراتۆریش دەگەیشتن. بەش بە حاڵی ئەوانەی کە لە لایەن ئاغا خاوەن کارەکانی ئەوڕۆمانەوە کاریان دەدرێتێ، وەک لە مانادا پەختە و خەساو، سەرژمێرییەکی ئەوتۆمان بە دەستەوە نییە.

واژەی «rabota» کە بە زمانی ڕووسی مانای کارکردن دەگەیەنێ لە واژەی «rab» کەتۆتەوە. خاڵی لە بیرکردنەوەی «کۆمەڵی بیکارە»وە تێ هەڵچوون، واتە: بە خەیاڵی خۆیان کاروبارەکان بە ڕابۆتەکان، ڕوونتری بڵێم، بە ئامێرەکان ڕادەسپێرن و بۆ خۆشیان وەک ئاغا ژیان بەسەردەبەن.

خوێندەی بەڕێز، بەندە لەم بەشە نووسینەمدا، کە جاکلینم بە نموونە و دەسکەلای ئینسانێکی لە سای ڕژێمی سەرمایەداریدا بە مردووێتی لە دایک بوو هێناوەتەوە، مەبەستم ئەوە نییە کە شەفاعەت بۆ ڕژێمێکی دیکەی ئینسانانەتر، بڵێین، لە گوێن سۆسیالیزمەکەی سۆڤیەتی بەرێ و چین و ماچین و ئورووپای ڕۆژهەڵات و کۆریای باکوور و ڤێیەتنام، بخوازم.. چون مرۆڤ لە سای ئەو ڕژێمانەشدا، ئەوجا چ گوناهی حیزبەکانیان بوو، یان خەتای دژمنەکانیان بوو، هەر نەحەسایەوە. مەبەستی هەرە مەبەستم ئەوەیە کە مرۆڤ بە تایبەت ئافرەت، نموونەی لە پێشدا دایک و کچ و ژنەکانمان، هێشتا بە لاقی غەیری خۆی دەچێتە دەرێ، بە چاوی غەیری خۆی دەنوارێتە دنیا، بە مێشکی غەیری خۆی بیردەکاتەوە، بە دڵی غەیری خۆی

دەبێ حەز لە یەکێ بکا و تەنها چتێکی کە ئی خۆیەتی نموەیە کە تا ئێستا چتەکانی خۆی لە دڵی خۆیدا ناشتوون و چاوەڕوانی ئەو ڕۆژەیە کە سەرلەنوێ لە دایک بێتەوە و ئەوانەی لە دڵیدان ئازادانە و بێ ترەتری ئێچرەوزان، چۆنی دەردەبڕێ، دەری بڕێ.. بە دەستم با و دەستم ڕۆیشتبا مامانێکی هونەرمەندم لە بۆ دایکان و خوشکان و کیژانی مێژوو سەرلەبەر، پەیدا دەکرد، هەرچییەکیان لە هیواداندا ناسێ بووە، بە ساناییی پێ لە دایک هانیبانەوە. بە هەزاران لە گوێێ جاکلین لە کۆمەڵگای کوردەواریدا هەن کە بە مردوویتی لە دایک بوون و وەکو سەربازی بێناو بۆ خۆیان هاتن و وەک جاکلین بە نائومێدییەوە سەریان نایەوە، خۆزی لە نەوە و نەتیژەکانیان - ئەگەر کوردەکە ئازاتر بژیێ - بەڵکو بتوانن خۆ لە نامۆییی ئەو دنیا پڕ زوڵم و زۆرە ڕزگارکەن و جارێکی دیکە سەرفرازانە لە دایک ببنەوە.

**تێبینی:**

**سەرچاوەکانی ئەم بەشە، دوای ئەوەی دووەمی ئەم باسە یادداشت دەکرێن.**

ئینسانەکانی دیکە چۆن دەنرخێنین و کاتێ لە ناویێەدا لە خۆ دەنوارین،
چ دەبینین؟ زانیاریمان لەمەڕ دنیای لێ پێ بەدیدەهێندرا، لەو ڕووەوە
بیرەوەرییەکانمان بەراوردووەوە، بە دوارۆژەوە هاوسەروکارن، یان
هاوسەروکار نین، مەسەلەکە دەگۆڕێ. تا چ ئەندازەیێ دەتوانین بەرەنگاری
کۆسپ و تەگەرەکانی هەبوونمان ببینەوە، چۆن - چۆنی دەنۆڕینە خۆ و لەم
بەرەنگاربوونەوانە خۆ قورتارکردنە، کارەکە لەوە زێتر نییە و لەوە بەولاوە
چتێکی دیکە لە گۆڕێدا نییە، ژمارەی ئەو پێوەندییانەی هەڵیان دەبژێرین
چەندە زیاد بکا، کۆسپ و تەگەرە و ناهەموارییەکان وەکو جاران بە بنبەست
و ناچاری نایەنە بەرچاو. کاتێ دەنوارین دنیا لە هەر کاتێ زێتر پڕە لە هەر
جۆرە ئاڵۆزی و کێشمەکێشێ، وا دەزانین نیدی ڕێگای چارەسەری
گرفتەکانمان چۆتە پشتی شێر و هەرگیز ڕێ دەرناکەین، کەچی تا ئاڵۆزی
زێتر دەبێ و گۆمەکە پتر قووڵ دەبێتەوە، درز و کەلێنگەلێ، کە دەتوانین
خۆمانی لێوە دەربازکەین، زێتر دەبن. ئەوەی ئەمن لێرەدا مەبەستمە،
ئەوەیە کە ئەو بۆشایی و سەرەداوانە بدۆزمەوە کە ئینسانەکان بە سەریاندا
باز دەدەن و خۆیانی لێ ئەهان دەکەن.

ئەمن لە ڕەهەندی شەخسییەوە بەڕێ دەکەوم و بەرەو یەکجیهانی پێ
هەڵدەگرم و لە هەمان کاتدا لەم ڕۆوە دەست پێ دەکەم و بەرەو ڕابردوو
وەڕێ دەکەوم.

هەرچەندم گـوێ لە سـکالاَ و دەردەدڵی دۆست و ئاسـیـاوان گـرت و گرێکوێرەیەک کە ئەمڕۆ بووگە وە خولیا و بنێشتە خۆشەی بە ددانی مرۆڤی ئەم سـەروبەندە تا دێ گـرێکوێرەی زیاتر تێ دەکـەوێ. ئەمن لەو ڕێگایە دەگەڕێم کە ئەم کەسانەی پێ لە نیگای پاشخانی سـەتان چەرخ و چاخەوە هەڵسـەنگێنم، لە وەڵامی ئەوە دەگـەڕێم کـە ئەگـەر ئەمـانە نەک هەر بیـر (زاکـیـرە)ی خـۆیان، بگرە بیـری غـەیری خـۆشـیـان بەکـارهێنابا، چۆنیـان ڕەفـتـارو هەڵسـوکەوت دەکرد؟ ئەمە لە هەلومەرجی گونجـاودا بە شـێوەیەک عەمبار دەکرێ کە بیر و ئەندێشـەی جیـهان ڕێگای بە ئاسانی دەکاربردنی نادا، هەر شـارسـتـانیـیـەک، هەر ئایینێک، هەر کۆمەڵێک، هەر بنەماڵە و خێزانێ، هەر پیشـەیێ، هەر نەژادێ و هەر چینێ دەگری، دەنواڕی مۆرکی تایـبـەتیی خۆی هەیە. مـرۆڤـایەتی تا ئەوڕۆکەش، بە گـشـتی تەنهـا هەر ئاوڕی لە ڕەگ و ڕیشـەی شـەخسـیی خۆی داوەتەوە، هەر بە خۆوە خەریک بووە و لەگەڵ لە دایک بوونیدا خۆی لە سەرلەبەری هەرچی میراتییەکی کە بۆی مـاوەتەوە و مـیـراتیی هەر کـەسێ کە لە ئەزموونەکانی ڕابردوو پێک هاتووە، بە خـاوەن نەکـردووە. هەر بەرەیەک دەبینی تەنهـا بیـر لەوە کـە لە خۆیدا نییـە، دەکاتەوە و تەنها هەر ئەو شـتـانەی کە پێشـتـرتی زانیـون، پەسـەند دەکـا و دەسـەلمێنێ. دەمـهـەوێ لە کـورتکردنەوەی باسی ئەم مـیـراتیـیـەوە، تێ هەڵچم، دیارە نـەک هەر بە گـێـڕانەوەی مـێـژووخـوانیی سـەربووردەی مردووانەوە، بەڵکو بە تەرزێ کە بزانین ئینسـانەکان چەندیان سـوود لە بەشـە مـیـراتیـیـە کـە لە ژیاندا کـاری لەو چـتـانە زێتـریـان بایەخ داوەتێ دەسەبەرکردووە.

لە ڕابردوودا کـاتێ ئینسـانەکـان نەیانزانیـوە چیـیـان دەوێ و بەریان و ڕووکاری هەسـتوخوسـت و سۆسەی ڕێدەرکـردنیـان لە دەست داوە و گـومـرا بووگن و بە هیچ کێلەڕێیەکەوە نەگیرساونەوە، چارەسەرەکیان، بە گشـتی لە گـۆڕینی خـاڵی ناوچەڤی لە دنیـاڕوانینـدا دیتـەوە و کـێلەڕێیـەکـەیان لە وەرچەرخـان و ڕوو لە بەریانی دیکە کـردندا، بەدی کـرد. بەم جـۆرە، ئەو

چتانەی کە جاران لایان گرینگ بوون، هەر بە جاریّ قەرقیشیان پیّ نەدەکرد. بیروبڕوای سیاسی بە کون فەیەکوونیّ داڕووخاون و جێگایەکانیان لە بۆ بیروبڕوای شەخسی بە جیّ دێلێن، تەخت و بەختی ئایدیالیزم بە دەستی ماتریالیزم ژێروژوور دەکریّ. ناوبەناوێکیش پاشەکشێی ئاییّن ڕوودەدا. هەوڵ دەدەم ئەوەتان عەرزی خزمەت کەم کە تەواوی خاڵە سەردەفتەر (ئولوییت)ەکان بە چ بەریانێکدا گۆڕاون و بۆ پەسندکردن و هەڵبژاردن (ئالتێرناتیف) و جویّ کردنەوەیان، چ جۆرە چاویلکەیەکیان گەرەکە؟! بە درێژاییی مێژوو ئینسانەکان ئەو چاویلکانەی، چ لە خۆنۆڕین و چ لە دنیانۆڕینیاندا، بیّ وچان گۆڕیون.

لە ساڵی (١٦٦٢)دا دامەزراندنی کۆمەڵەی پاشایی لە لۆندەرە خاڵی لەخشتەچوون و لەگەچوونێکی گرینگی لە ناوچەق (بۆرە)ی سرنجدان و وردبوونەوەدا هێنایە ئاراوە. بە پێی بیروبۆچوونی دامەزرێنانی کۆمەڵەکە سەبارەت بەوە کە ئینسانەکان ئەیان دەزانی چۆن لە چتان وەکۆڵن، دامەزراندنی ئاوها دەزگایەک زۆر لە جێی خۆیدا بوو. ئەم زانایانە و ئەوەکانی پاشە وانیش، شاقەلیان لیّ هەڵماڵی و چەندین بواری وەکۆڵینیان وەسەر گازەرای پشت ئێخست و لەسای سەری ئەمەوە، سەرتاسەری دنیا دەستی بە جۆرێکی دیکە بەدیارکەوتن، کرد. وەلیّ وەکۆڵینی زانستانە توانا و لێومشاوە و پسپۆڕ و کارامە و لێزانی گەرەکە، نەک خۆ لە خۆڕایی هەڵکێش و فسفس پاڵەوان، دەنا زۆر فسفس پاڵەوان تەنیّ هەر لە دوورەوە لە تەوازووی ڕواڵەت بەولاوە چیدیکەیان بەرناکەویّ و ئەم وەکۆڵینانە بەش بە حاڵی ئەو بڕیارانەی کە ئینسانەکان لەمەڕ ژیانی ڕۆژانەیان دەیدەن، هیچ کارناکەن و هیچیان تێدا بەستە نییە. لە سەتەی (١٩)دا ناوچەقێلە خشتەچوون و داخزینەکان زیاتر خەستوخۆڵ بوونەوە و تا ڕادەیەکیش مێشک تێکەڵی و پێکەڵییەکی هێنایە گۆڕیّ. گەشتەکەی ئەمریکای ساڵی (١٨٣١)ی Tocqueville Alexis de بە نومێدی ئەوەی لە ئەمریکا دەروویەک بەرەو دواڕۆژ کردەوە و چتهایەکی

ناخـواسـایی (خـارق العـادة) به دەم شنەی ئازادییـەوە بدۆزێتـەوە، سەروبەرنرا، تازەبکرێتەوە و دیموکراتییانەتر سەروبەربنرێن. بەش بە حالی Tocqueville ، بە کوڵێ بە ناخێـر رژێمی ئەوتۆ کە لەسـەر بنەمـای سەرکوتکردنی کەمینەکان بە دەست زۆرینەکان دامـەزراوە، لە بۆسەدایە و چاوەنۆڕیی دەکـریٚ و هێشـتـا ئەو شـوێنانەی کـە کـەمـینـەکانی تێـدا بە تەواوەتی دەس لە ملاتی رەحەتی و سەرسووکی و حەسانەوە نەبوون، ئەوە جاریٚ وەک تەیری عەنقـا و چێشـتی خانەقـا و شـاری جابولقـا واسـە.
هەروەها لە هەمـان سـاڵدا گەشتەکەی داروێن، لەمەڕ دنیای ئاژەڵ کە ئەو سـەروبەندە خـەڵک بـایی هێندەیان بڕوا پیٚ دەکـرد، کـە بە کـەڵکی بەرژەوەندیی ئینسـانەکان دیٚ، سـەرنج و بۆچوونەکان و سـەرپاکی ئەو بیرو ئەندێشـەیەی کـە شابالی بەسەر هەمـوو گۆڕەپانەکانی هەبووندا دادابۆوە، بەرە بەرە بە چـێـکی کـە خـێـرا بلاوبۆوە، بە خـەباتێکی لە پێناو ژیاندا، وەگێـرا، بەلام داروێن کـە بۆ خـۆی گلی و گـازنی لەوە دەکـرد کـە بە هۆی دۆکـتـۆرینەکـانیـیـەوە هەست بەوە دەکـا وەک یەکیٚ «تووشی ڕنگکوێری» بووبیٚ، لەنگەری ئالهـا ئیـسـتـەتیکەکـانی لەبارچوون و زەینی وەک "مەکینەیەک کە کۆمەڵە بوویەرە زەلامەکان بهارێ و یاسا و ڕێـسا گشتییە لە هەرمێنەکان ڕەنێوبهێنێ چۆن دەبێتە مایەی ئەوە کە مرۆ «بەختەوەریی خۆی لە دەست بدا» و لایەنی هەستوخوست (احسـاسـات)ی سروشتیی ئینسـان چۆن ون دەکا و پەکی دەکەویٚ" بەو جۆرەی لیٚ قەوما. ئەو گەشتەی کە مارکس بۆ دنیای پڕ لە چەرمەسەری و کوێرەوەریی کرێکارانی ئەنجام دا و ئەو دەوڵەتەی کـە نیـازی وابوو بە شـۆڕش و هەڵگەڕاندنەوەی تەخت و بەختی واقیـعی برش هەڵێناو و گـەنیـو کە تا سـەت سـاڵێکیش دنیـای خرۆشاند ئەوەتا ئەوهای لیٚ بەسـەرهات، هەرچەندە شـۆڕشـەکـان بەنیـازی چاکـیـشـەوە هەڵایسـێندرێن، بەلام بەدیارکـەوت کـە بەڵێن و گـفـتـە خۆشکەلەکان، چەندە لە هێزوپێزی بەدیهاتن بیٚ بەهرە بوون. لە پاشە وی، لە دوادوای سـەتەکـاندا، فـرۆیدیش دە گـەشـتـێکی بەرەو زانسـتی

نەخـۆشـیـیـەکـانی تێکچـوونی ڕایەڵەکـانی دەمـار Nevrotic (عصاب)ەکانی دەکرد. ئەم گەشتە کارێکی زۆری لەو ئینسانە کرد کە لە دڵی خۆیاندا چ دەبینن، لەبەرچی لە نێو ناخ و دەروونی خۆ ڕۆدەچن و وەک کوندەبوو دەژیێن، کێ بە تاوانبار دەزانن، بەڵام کاتێ لە حاڵەکە گەیشتن، ئومێد و ئاواتی ئەو کەسانەی کە بە تاوانباریان دەزانین، هەموو با بردی..
ئەم بیـرمـەندانە هەمـوویان بیـریان لە ئاوچەقی یەک خـاڵدا خـەسـت کـردبۆوە(١)، ئەویش چەمکی دووفـاقی و لێـک دڕدۆنگی و لێـک هەڵەنگوتن و دەگژیەکدی ڕاچوون بوو. مـارکـسـیـەت لە یـاسـای دووفـاقی (تناقض) و نە لە نەکردن (نفي النفي)ەوە بەرێ دەکەوت، لەو بڕوایەدابوو کـە بزووتن خـەسـیـەتی مـاددەیە، مـاددە هەمـیـشـە لە گـۆڕانێکی دیالێکتیـکیـدایە. گۆڕانەکەش مارێچانەیە، واتە: لە ئەنجامی بەرە - بەرە کەڵەکەبوونی چێی ماددی و بەشەڕهاتنی پێکهاتەکانی ماددە لە نێو خۆیدا و لەپڕ ئەوی بەهێـزوپێـزە زیندووەکـەیان بڕسـتی لە بێ هێـزوپێـزەکـان و مردووەکـانیـان دەبڕی و ئەویان ئاڵای سـەرکـەوتن هەڵ دەکـا و ئەم زۆران و زۆرانبـازیـەش هەر وا بووە و هەتا هەتایە هەر وا دەبێ و گـۆڕان و گەشەکردن و پەرساندن و تەنینەوە، ئەمە ماناکەیەتی. مـارکسیەکان پێیان وایە هەر بیـروبڕوایەکی دیکە لەمـەبەدەر بۆ شـاردنەوەی ئەم زۆرانبـازی و شەڕە بەردەوامەیە و تەنها بۆ پارستنی بەرژەوەندیی چینایەتیی بەرتەسکە.
بەڕاستی ئەم تەرزە بیرکردنەوەیە لەمێژە مرۆڤ پەی پێ بردووە.. تاریکی و ڕووناکی (ئەهورا و ئەهریمەن)، چاکە و خراپە (شەیتان و ڕەحمان)ی ئایینە کـۆنەکـانی سـەر زەوین و ئاسـمـانیـیـەکـان، بە ئەلفـبێـتـکەی بیـروبڕوای مـاتریالیسـتانە لەقەڵەم دەدرێن. ئەمن بۆ خۆم بڕوام بەمە ئەستوورە، بەڵام نەک بەو مـانایەی کە ئینسـان هەتا هەتایە بەرانبـەر بە یاسـا و ڕێسـایەکانی "خـۆڕسـک" دەسـتـەپاچە و دامـا و مـجـرۆ و مـوزمـەحـیـل و دەسـتـەوئەژنۆ دانیـشێ، بەڵکو بەو مـانایە کە یاسـا و ڕێسـایەکـانی خۆڕسـک تـا چەند سـەروەخـتێ بە زۆر و لە ناچاری و کـوێرانە لەقـەڵەم دەدرێ و مـرۆ لە

فەرمانیان ناتوانێ سەرپێچی بکا و لە ژێر دەسەڵاتیان ناتوانێ ڕەهابێ و بە سەر کار و ڕەفتاری خۆیدا زاڵ و وشیار نابێ، بەڵام مرۆ هەر بەوەندەی کە لە یاسا و ڕێسایەکانی خۆڕسک حاڵی دەبێ، ئیدی ئازاد دەبێ. یاسا و ڕێساگەلێ کە پێشتری بەسەر کار و ڕەفتاریدا زاڵ بوون، بە پێچەوانەوە ئەمجا ئەوان دەبن بە گوێڕایەڵ و ئاڵقەلەگوێی ویست و ئیرادەی وی.

ئاشکرایە، ئەم ئازادییە بۆ نموونە لە مارکسیزمی ڕووسیدا چەمکێکی فەلسەفی و جوداوازیی لەگەڵ ئازادیی شارستانیدا هەیە. ئازادی بە مانای دووەم سەروکاری لەگەڵ تاک و دەسەڵاتی سیاسیدا هەیە، بەڵام جیهان هێشتا لە چنگوڕکی ئەم تەرزە بیرکردنەوەیە ڕزگار نەبووە، تەنانەت ئەوانەی کە دەیانهەوێ مانا و چەمکی لێک هەڵەنگوتن و زۆرانبازی بسڕنەوە، سەیر لەوەدایە کە هەر هەمان مێتۆد و تەرزی بیرکردنەوەکانی ئەوان بەکاردەهێنن... واتە: حارەو گوتەنی "وداوني بالتي هي الداْء"..

تایبەتمەندیەتیی سەردەمەکەی ئێمە لەوەدایە کە لە بریی بیرونەندێشە، سەرلەبەر لە خاڵی لێک هەڵ پڕژان و قەڵتوبڕ خەست کردنەوە، خۆشبەختانە بەرەو زانست هەنگاو هەڵدەگرێ. پێش ئەوەی مەینەتییەکان، نەخۆشینەکان و تاوانەکان ڕووبدەن حەز لە بەرەوبڕی لێ کردنیان دەکەین - حەز لەوە دەکەین لە جیهانێکی یەکپارچەدا پشوو بدەین.. هاتنەمەیدانی ئافرەت بۆ نێو گۆڕەپانە گشتییەکە وەڵامی ئەوە دەداتەوە کە فەمینیزم بە مانا ئینسانییەکەی لە ڕەوا ڕەواترە و ئینسان زێتر بە پەرۆشی هەستوخوستی یەکدییەوەن، تا دامودەزگا دامەزراندن و پاشان ناچار بە دەستە خۆش ڕووخاندنیان. ئەوەش لەبیرنەکەی کە وێڕای ئەم هەموو تروسکە گەشانەی ئاسۆ، هێمان تەرز و شێوازی بیرکردنەوەی کۆن و ڕزیو، مرۆڤەکان بەڕێوەدەبەن. دە بەرابەر ئینکەبەری و قوونەجوڕکێی نەقڵ و مێشکە هێشک هەڵاتوو و بە هێک بووەکاندا، نە سیاسەت، نە ئابووری، وەک هیچیان تێدا بەستەنەمابێ وان. هۆش و ئاوەز بە فەرمانان ناگۆڕێن، چونکە بۆ لەناوبردنی چتێ کە لەناوبردن بەدەرە و مەحاڵە، پەنا

بۆ بیرەوەرییەکان دەبرێ، بەڵانەکینێ لە جیاتیی وەی هەمیشە هەر لە جفزی هەمان بیرەوەرییەکاندا ئەمسەر و ئەوسەر بکەین و بە دەوری خۆماندا بخولێینەوە و کورد گوتەنی هۆری هۆری بێینەوە سەر.. بۆری، بۆ تاوتووکردنێکی ئەو بیرەوەرییانە نەکەین.. کابرایەکم دەناسی، کە کوڕەکەی دەستی شکا بردییە کن شکستەگرەوەیەک، کەچی کە نەخۆش دەکەوت، دەیبردە کن مەلای گوند، کشتەکی بۆ دەبڕی.. ئەمە چەندی بە چەندە؟ دەیجا بۆ نەیەن ئەو دوو بیرەوەرییە کەمێ فرەوان کەینەوە..
کابرایەک گورگی کوشتبوو، ئەو نەبا لە گوند، لەندەهووری بنی سەعدانیش با، ڕێی نەدەدرایێ بە تیروکەوان و تەشتی مس، گرفت بڕەوێنێتەوە.. وەرن بزانین برک و تەشتی مس و تیروکەوان چی پێکەوەی جوتبەقی کردوون و ئەم موعەممایە لە کێندەر ئاو دەخواتەوە.. ئەمن پێم وایە ئەگەر چارچێوەی ئەو بیروەرییە شەختەبەندانە بشکێنین، ڕەنگە لە دووبارەکردنەوەی هەمان نەقەرات و نوێکردنەوە هەمان هەڵەکان، کەم تا کورتێ خۆ بدزینەوە. سەت ساڵ لەمەوپێش ئەورووپا لەسای شەڕی چار ڕووبەڕووهاتنی نوێوە، ڕێنەسانسێکی وەسەر پێیان نێخست و چار وشیارکەرەوەی نوێی دەگەڵ ئەقڵ و ئاوەزیدا تێکەڵ کرد و ئاسۆ و بەرچاوی ڕوون و فرەوان کردەوە، یەکەم بیرەوەرییە لەبیرکراوەکانی ئازادی و جوانیپەروەریی بووژاندەوە، بەرانەکینێ کە ئەوەشی کرد، تەنها بە فەرهەنگی یۆنان و ڕۆما داکەوت.
بەندە دەمەوێ، لەم نووسینەمدا ئەو کەسانەی کە لایان وایە سەرلەبەری بیرەوەرییەکانی مرۆڤایەتییان لە دڵی خۆیاندا وەشارتییە ڕاچڵەکێنم و لەو مەزەنە و خەیاڵبافییەیان قورتارکەم و لە ڕێی دەکاربردنی ئەمانەهێ، دەستدەمە پیلیان و لە چەقینەکانی ئەوڕۆمانیان دەرێنم و بەرەو هەر هیچ نەبێ ئەو بۆرە تارمایییانەی کە لە شەڕەگەڕەکی سیاسییانە بەدوورن ڕادەم..
دووەمیان بە شەکراوخراردنەوەی ئەورووپا و ئەمەریکا و لە سای سەری تەکنۆلۆجیای نوێدا ڕێنەسانسێکی دیکە بەدی هات. وەلێ ئەمە زێتر سەروکاری دەگەڵ هەڵێنانی موعەممای کەرتێکی جوغرافیای دنیادا هەبووە

تا هەڵێنانی مەتەڵۆکەی ئینسانان و دەگەڵ یەکدیدا ئاشناو ڕۆشنابوون. کەچی وێڕای ئەوەی کە هەر کەسێ کامەی گەرەک وێ، دەتوانێ دەگەڵی باخێوێ و بۆ هەر کوێیەک خوایشتی لێ بێ، دەکارێ تەشریف بەرێ، کڕوکپی و بێ ورتەیی و کەم دەمودوویی و لاللوتیی نیشتەنییانی زەوین هەر بەردەوامە.. ها پاش چەندین چەرخ و چاخ و چەندین لێشاوی کوشتوکوشتار و تەڵتوێر و ئەتۆمباران و کیمیاباران و قوزەڵقورتباران و زەهری مارباران و براکوژی باران بەرژەوەندی باران و کۆیلەتی باران و بە دەستەجەمعی ئینسان زیندەبەچاڵکردنی نەخوازا کوردی هەناسەساردباران کەس نەبوو باسێکیان بکا. ئەمن دەمهەوێ سەری خۆم بەوەوە گێژ بکەم کە بۆچی هێشتا ئەو دنیایە گوێی خۆی ئاخنیوە و ئەم گوێ ئاخنینەی چۆن لەکۆڵ بێتەوە..

ڕێنەسانسی سێیەم، لە سەر گرێژەنەی بایەخ بە تاکدان دەخولێتەوە، وەلێ ئەم دەزگایە بارودۆخێکی ناسکی هەبوو، چونکە مرۆڤایەتی بێ وچان چاوەنۆڕیی شیرەت و ئامۆژگاری و واق وڕمانی دەکا. ڕاستییت گەرەکە وەک بێژی بە دەست قات و قڕیی بێ شیرەتی و بێ ڕێنماییەوە بناڵێن و بە ڕێژێکی لە هەست بە پێداویستیمان زێتر گوزەران دەکەین. پەرۆشی ئەوەم کە ڕێباز و مێتۆدەیلێ بگرمە بەر کە بتوانم لەوانڕا ڕووبەڕووی ئەو پێداویستییانە بیمەوە. ڕێنەسانسی دووامین دەگەڵ بیرێکی نوێدا کە لەگەڵ چۆن - چۆنی لە ئایین حاڵی بووندا سەروکاری هەس، ئامانجی هەموو ئایینەکان ئەوەبوو کە سەرلەبەری ئینسانەکان یەک بێخن، کەچی تا توانیویانە لێکدییان دابڕیون و لێکیان بە دژمنی خونخوار کردوون.. شەڕەئایین هێشتا هەر گەرم و بەردەوامە و دەرکەی لەسەر پشتە.. دەمەوێ نەک هەر لەگەڵ باخودایان، بگرە دەگەڵ ناخودایانیشدا کە لەسەر زۆر چت کێشەیانە، شەڕەقسە بکەم. ئەوانی کە ئینسانەکان لە یەکدی جوێ دەکەنەوە، چین و کامانەن؟ فرەیان لەسەر نووسرا و بە باریکان ئەستووران زۆریان لەسەر ڕێسریا... ئەمن مەبەستم ئەو خاڵە هاوبەشانەن

کە دە یەک جغزدا کۆیان دەکەنەوە. من ناورم لەوانە داوەتەوە کە چۆن بە دیداری یەکدی دەگەیەن، چۆن بیر لە یەکدی دەکەنەوە؟ ڕەنگە بە ناوی زۆر جیاواز - جیاوازەوەم بیر لێ کردبنەوە و بە شێوەیەکی فرە جوێ - جوێم کارەکە سەروبەر نابێ، بەلام هاوسەروساختیی کۆن و نوێ و دوور و نزیکی نیشانەکان هەر لە نواوە بە درێژاییی مێژوو بنێشتەخۆشەی بن ددانی وەکۆلین بوون و کەرەستە و ماتریالی کارخانە و کارگەی حەزرەتی مێژوو بووگن. ئەوانەی پێیان واسە کە گیان پرشکێکی خوداییە، بە دیداری خوداوەند گەیشتنیان بەلاوە لوتکەی نامانجەکانیانە و بە یادی قارەمانان و لە خۆیایی بوونەکانەوە مەست و سەرخۆشن و بە سیحر و جادوویانەوە گلاون، بەشێکی لەدەست لێ هەلگرتنبەدەری هەرەتی گەورەبوونی وانە.
فەرمانفەرماییی ئەو هەلپانەی کە بۆ دیداری "یارەکەی ئەولا" گەیشتنیان بە خەرج داون، تا دێ خەستتر دەبێتەوە. باب و داک بۆ لەم خەیالپلاوانەدا بەشدارکردنی مندالەکانیان - مالم قەبرە - هێندەی موویەک درێغییان نەکردووە و مالیشیان قەبرە، هەرگیز ناشێکەن..
ئەو ماوەیەی کە هونەرمەندان هەستوخوستی برێ کەسانیان تێدا دەربڕیون، دەکەوێتە خانەی نالقەزترینەکانی فەرهەنگی مرۆڤایەتییەوە. بەشی گەورەی بیرو ئەندێشە و بیرەوەرییەکانمان لەگەل بیرو ئەندێشە و بیرەوەرییەکانی کەسانی دیکەی مردوو، یان زیندوودا لە جیلوە و سەرەتاتکێدان. پوول و دەسەلات هەرچەندە، کە بووگن وە خولیایەکی ڕیشاژۆ و چەسپیو و لە کێشە و مشتومڕەددەر، ودلێ وەکو دوایین چت بووگە بە پێناوی نامانجێکی مەحرەمانەتر.. ئەمن بیر لەوە دەکەمەوە کە مرۆڤایەتی لەمەڕ مەبەست لە هەبوون و هاتن و گۆڕبەگۆڕچوون، تا چ ئەندازەیەک تووشی سەرەخولێ بووە و بۆ ئەوەی سەرەوەدەرێکی نوێ بەدی بکا، چ بکا باشە؟
نیشانەکان هەرکە ئەولاتری دەوروبەرەکەی خۆیانیان بەر تیلاییی چاویان دا، فێرەخوێندنەوە، گەشتوگەڕان، بەدیداری خەلکانێکی زۆری

دیکەی وا گەیشتن، ئەوەیان بۆ بەدیارکەوت کە لە زۆر خولیا و ئارەزوو و ئاڵها و ئامانجدا هاوماڵن، بەلام وێرای ئەمەش بە دەگمەن دیدارێکی پڕ لە بەروبوویان وەگیرکەوت. تا ئەوڕۆکەش ئینسانەکان زۆر کەمیان هەلی ئەوەیان بۆ هەڵکەوتووە کە بتوانن لە یەکدی بگەیەن، یان وەبزاوت بکەون و سەربەخۆ ڕوو لە کەین و بەیان بکەن و دەست دەنە دەستی یەکدی..

ڕاستە خووی پەرەدان بە هۆکار و پێناوەکانی بە یەکدی گەیشتن و بە دەنگی یەکدییەوە چوون گەیشتۆتە ئاستی سەردەفتەریی مرۆڤایەتی، وەلێ بە چاوی ژیانێکی کە بە تەواوی ماناوە سەرلەبەری هەل و دەرفەتی بە دیداری یەکدی گەیشتنی بە دی هێنابێ، ئانۆڕینە دنیا. لە باری هەرە لەباری ڕێکەوتی بە دیداری یەکدی گەیشتنی ئینسانە تازە نەفەسەکاندا، لە ڕۆژی ئەوڕۆماندا، سەرچاوەی هەرە گرینگی لەسەر پێ ڕاگرتن، چلەپۆپەی ئاوات و ئومێدەکانە..

ئەتۆ کێهە موعەمما و مەتەڵۆک هەڵێنانێکی ئەو دنیا پان و بەرینە دەگری، دەبینی لە ئاوکرۆکدا بۆ خۆی لە هەڵپە و وەکۆڵینی لەو جۆرە بابەتە و لە بیروبۆچوونەیلێکی کە هێمان لە شوێنێکدا گەڵاڵە نەکراون، کەوتۆتەوە. ڕێگای ژیان ماناداركردن و جوان و خۆش کردنیش لە نەزم و نەسەقدان بەو چتانەی کە بێ نەزم و نەسەق و ناهاوسەروکار دیارن، بە یارمەتیی وردەکاریگەلێکەوە کە نابێ پشت گوێ بخرێن پێکەوەگرێدانی ئینسانەکان، شوێنەکانیان، ئاڵها و ئارەزووەکانیان و بیرەوەرییەکانییەوە، تێدەپەڕێ. لە دوو گیانێکی جەرانەی کوتومت لە گیانی خۆمان ئاسایی گەڕان و وێڵ و سەرگەردان بوو، تەنها بەشێکی ژیانی مەحرەمانەی ئێمەیە. سەبارەت بەوە کە ژیانی مرۆڤ تا دێ دەبێ بە چتێکی فرەڕەهەندو لایەن، ئەمن قسە لەوە دەکەم کە ئەگەر هات و دوو کەس یان زێتر تایبەتمەندیی شەخسی و ڕەفتار و ئاکاریان دەگەڵ یەکدیدا جۆشیان نەخوارد، چتێ هەر ڕەنێو دەهێنن، خۆ ئەگەر بە جیا - جیاش کار بکەن ئەوە هەر یەکە دیسان چتێ ڕەنێو دەهێنێ، بەلام نی یەکێکیان لەوی

دیکەیان زیاترە یان باشترە، ئەمن قسە لە ڕێز و حورمەت گرتنی ئەم جوداوازییە دەکەم، نەک کارامەیی و لێهاتوویی و لێوەشاوەیی یەکێکیان بە نێوی گیانی هەرەوەزی و هاوکاری و لەخۆبوردنپارێزییەوە بە قوربانی ناکارامەیی و بێلێهاتوویی و بێلێوەشاوەیی ئەوی دیکەیان، بکەم. هی ئەوتۆ هەس، تەنیا لەسەر کورسی و مێز پان بوونەوە و قوون بادان، گۆی گرێوی بردۆتەوە، کەچی هونەرمەندی دەست ڕەنگینی بەردەستەکانی، ئەوان هەموو کارەکە ڕادەپەڕێنن و خودانەخواستە، ئەگەر هات و یەکێکیان ویستی چتێ لەبارەی هونەرەکەیەوە بکا بە مۆرکی بەرهەمەکەی، کە هەقی خۆیەسی، کابرای سەر کورسی و مێزەکە بە قەڵەمێکی سوور، یەکسەر هێڵی ڕاست و چەپی پێدا دێنێ.. کێ حەددی ئەوەی هەس پێ لە قەڵەمڕەوی قۆرخی وی باوێ!! کاکە لێیانگەڕێ، با ئەو ئینسانە هونەرمەندانەش ڕەنگ و ڕوویان لە کن خەڵک ئاشنا و ئاشکرابن... جا ئەگەر هات و لە چتێکمان بەو تەرزە نواڕی، کە لە زانستی مادده پێکهاتندا دەیبینین، واتە: چۆن هەر چتە لە ناوەوە بە جۆرێ ماددەکان (Molecule)ەکانی ڕیزکراون و نەزم و نەسەقی خۆی هەیە و بە چاو فەرقی پێ ناکرێ و ئەگەر هات و سەرلەنوێ بە شکڵێکی دیکەی داڕێژییەوە، دەگۆڕێ و ماددەکانی بە سەتان داوی ناسک - ناسک، پێکەوە زۆر ڕێکوپێک تێک ئاڵقاون و وەک باندێکی مووزیک کە هەریەکە لە ڕەنگێک و هەریەکە لە ئاوازێک و هەریەکە لە ماددەیەک پێکهاتووە، یەک پەیکەرەی مەقامێ پیکدێنێ. کەچی ئەگەر لە شڕوشکڵی ئامێرە مووزیکەکان بنواڕی، تەماشا دەکەی، یەک لە شام و یەک لە حەڵەبە، دمبک، دەف، شمشاڵ، تەنبوور، پیانۆ، ئۆکۆردیۆن، دە شکڵدا کێتەیان وەک کێتەیان دەچێ... جا ئەگەر هات و ئەوهامان چتەکان دیتن، هەنگێ ئەمە بۆ دۆزینەوەی هاوپێوەندییەکانی نێوان ئینسانەکان کە تاوەکو ئێستا وا بەرچاوەکەوێ لە هاوئاهەنگی و دەس لەملانێ بەدوورن، دەبێتە سەرچاوەیەکی دەوڵەمەند... دەڵێن فەلسەفە

کاری ئەوەیە کە حەدد و سنووران لە نێوان ڕاستییەکاندا دەسڕێتەوە، هەرچی هونەرە بۆ هەموو چتێ تایبەتمەندیی خۆی بەدیاردێخی و سنوورێکی ناسکی لەبۆ دادەنێ.. واتە: لە جوزئییات، نەک لە کوللیات، دەدوێ...
هەرچەندە من باوەڕم بە فەلسەفەی هاوئاهەنگیی هەبوون (مۆنادەکان)ی لایبنتزی ئایدیالیست نییە، بەڵام ئەگەر لە یەک سەرەوە، لە ڕاستی بنۆڕین، خۆت لە دیالێکتیک نەبان کەی، تابلۆیەکی جوان و دڵڕفێنە.. ئەمن بروام بەوە نییە کە تۆ پاڵی لێ بدەیەوە و چاوەنۆڕی دیداران بی. ئەسڵەن خەیاڵی هەروا لە خۆڕا تەفروتوونابوونی کۆسمۆپۆلیتەکان، دژمنەکان، زۆر ساویلکانەیە و لەبەر ئەوەی حیسابیان بۆ ئەوە نەکرد کە هەر مرۆڤێ، یان هەر گرۆیەک بە چ جۆرێ و چەند دڵیان دەرەنجێ، برستی خەڵک بە برواهێنانییان لەبەربڕا و گومڕابوون. ئەمن لێرەدا واز لەو پێوەندییانەی کە تایبەتمەندییان بە شەخسەوە هەیە و تاکەکان لە یەکدیی نائاسایی (لە یەکدی نەچوون) دەگرن، دێنم، من بیر لەو پێوەندییانە دەکەمەوە کە چۆن لە ئاستی جۆراوجۆری نزیکایەتیی نێوان کەساندا، بەرەی جۆراوجۆر بنیات دەنێن. ئەوجا با بە خەیاڵداهاتنی ئیحتیمالی ڕێنەسانسێکی کەون و فەرتووتیش بێ، بزووتنەوەی بووژانەوە و نوێکرانەوەکان، با، تاوەکو لە خەونیش بێدارەبنەوە، زۆر بخایەنێ، بەڵام کە بۆ خەوی زستانان دەکشێنەوە نێو قەپێلکی خۆیان هەمیشە زگیان بە هیوا و ئاواتی نوێ پڕ بووە. دیارە، چاوەنۆڕی ڕێنەسانسێ کە بە بڕوای یۆتۆپیاکانەوە وەگەڕێنە پاشەوە خەیاڵپڵاوە؛ چونکە ئەوها بڕواکردنێ، ڕێگای لەبۆ زۆر مەینەتی خۆش کردووە. جا بۆ ئەوەی هێلێکی نوێ بۆ خۆت بکێشی، پێویستە تا ڕادەیەک لەناچاری بە هەڵەداچوون، بسەلمێنی. بەش بە حاڵی هەڵەکان بێت و خۆتانی بۆ تەیارکەن و لە هۆکارەکانی حاڵی بن، توانستی ئەوەیان نابێ بە زۆر ورەتان پێ بەربدا.

خوێندەی هێژا، زانیارییەکی کە لەم نووسینانەدا عەرزی خزمەتتانی دەکەم، نامەهەوێ بە هەمان زمان و کەتەگۆریا (مەقوولات) لە

باوەکانەوەتان پێشکێش بکەم، ئەگەر بەو تەرزم کردبا، دەبوا بستێ لەو هۆکارە ئابووری، سیاسی، کۆمەڵایەتییانەی کە دە هەر هەنگاوهەڵێنانێکی مرۆڤایەتیدا ملیان قوت کردۆتەوە و شوێنگۆڕکێیان دیارە، ئەترازابام - جا ئەمن ئەوەم بە خۆم نەکرد، بەڵکو هاتم لە نیگای بیروبۆچوونی بەرەی ئەورۆوە لەمەڕ ژیان، بە مەرجێ زێتر رووناکی وەسەر کێشە و گرفت و پرسەکانی ئەورۆ بێخم. تێ هەڵچووم و کە ئەمەشم بەم تەرحە کردووە، ئەوەیە کە بەڵکو بتوانین، چارەسەرێ دەسنیشان بکەین، ئەزم و ئەسەقێکی نوێ بە زانیارییەکانمان بدەین و سەرلەنوێیان تاوتووکەین و خاڵە جەمسەرە نوێیەکانی نێوان رابردوو و ئەمرۆمان و نێوان ئەوانەی دەستەمۆن و ئەوانەی نامۆن، بدۆزینەوە.

مرۆڤێ، کە باسی دەکەم رەنگە لە زۆر دنیای دیکەش و لە کوردستانیشدا نموونەیان لە ژمارەبەدەربن و لە دوو ئاقاریدای دەنۆڕمێ: یەکەمیان، ئەمن هەرچی رووداو و دیاردەکان هەن، لەگەڵ کونی دەرزیدا ناگونجێنم، بەڵکو میتۆدێ، رێبازێ، تەرزەبیرکردنەوەیەک و ئەختێ لە ئاقاری راستی نزیک کەوتنەوەیەک پێشنیار دەکەم. دووەم: نەک تەنها ژیانێ، تەنانەت ئەگەر چەند ژیانێکی دیکەش بژیێم، بەشی ئەوە ناکا ئەزانی و کوڵەوارییەکانمیان پێ بشۆمەوە، دەرۆستی سەرلەبەری زانیارییەکان بێم. مارکس، فرۆید، داروین، ئەنیشتاین، ئیبن ئادەم، مەلای گەورە، مەسعوود محەممەد، ئەحمەدی خانی و تاد... دەجاری دیکەش بژیێنەوە و دە هێندەی دیکە گوناهی ئەزانیی خۆیان بە دە ئاو و ئاراوان بشۆنەوە و دە هێندەی دیکە زانیاری و چارەسەر بۆ مرۆڤایەتی پێشنیار بکەنەوە، ئەوە هەمووی تویشەی - بە تایبەتی لەم دنیای زۆر بەدەمودەستەدا - زۆر - زۆر هەر نیو سەتەیە... بە زێتر لەپێویست زانایی و دانایی و عیلم و عیرفان چ دەکرێ، ئەوە مەتەڵۆکە گەورەکەی چەرخ و چاخەکەمانە... چارەسەرەکەی من ئەوەیە کە دیاردەکان لە ژێر زەرەبین (میکرۆسکۆپ)ێکیش و دووربین (تەلەسکۆپ)ێکیش بێخم و وردە

جیاوازییەکانی نەزموونکراوترین لایەنەکانی ژیان هەڵبژێرم و هەموو پرس و کێشە تەواوعەیار و پێوانە گەورەکان لە دوورەوە، وردکەمەوە. ئومێد دەکەم بتوانم لە مرۆڤە کۆڵەوارەکان ڕاگەیەنم کە سەرێشکایەتییەکی زۆر دەوڵەمەندتریان لەوەی کە مەزەنەی دەکەن، لە پێشێیە.. ئەمن لەم نووسینانەمدا نە ژمارەی دیاردە و ڕووداوانت بە توورەکە بۆ هەڵدەڕێژم و نە بە قیاسی مەنتیقی و گشتاندن (تعمیم) و ئەنجامگریی حوکمی ئەقلی و عورفی حوکمانت پێ دەسەلمێنم... پێرستکاری و نموونەکاری و تیپیکالکاریت دەگەڵدا یاری ناکەم. ئەمن باسی کەسانێ دەکەم کە دەیان ناسم، یەک لێرە و یەک لەوێ - یەک لە شام و یەک لە حەڵەب. زێتریش قارەمانەکانم لە ژنان هەڵدەبژێرم.. ڕەنگە بپرسی بۆ؟ یەکەم لەبەر ئەوەی کە من لە بەرەی ئەوان نیم، دووەم ئەگەر هات و خۆشبەختانە و خواوراستان بە تەواوەتییان تێ گەیشتم، هەرگیز بای خۆفشکردنەوە و لەخۆبایی بوونم دە کەپوو نەچێ و خۆم بە چتێکی دیکەی لە عالەمبەدەر زێتر نەزانم و وەک هێندێکیان کە هێشتا سەرە واویان دە گەروودا ئاسێ ماوە سات نا ساتێ نەڵێم «ئاخر من دەڵێم... من قسەدەکەم...» سێیەم: حەزرەتی ژن لە هەموو چەرخ و چاخەکاندا، ئەوان کەولسووری پێش لەشکری پێشکەوتن بوون و ئەورۆکە ژن لاپەڕە هەرە دەوڵەمەند و بەهێزوپێزەکانی ئەدەبیاتی هاوچەرخیان ڕازاندۆتەوە.. قەت لەوە خۆشتر هەیە، پیاو لە نیگای دایکییەوە ژن لە خۆی بە گەورەتر و عالیجەنابتر و بە زاناتر و فەیلەسووف تر و بە سەرکردەتر و بە هەموو چتترەوە بزانێ. ئەورۆکە چەقینێ کە ژن لە کێشە و ململانێ دەگەڵ مێشکە ڕزیوەکاندا هێناویەتییە گۆڕێ، چەندین ڕەهەندی بە بارستی وای هێناوەتە کایەی سەگمەحەوشەوە کە بە دەیان پلە خەڵکانی دیکە دەبەر سێبەر ئێخستییە. ئەمن هەوڵ دەدەم باسی ئەوە بکەم کە لە کوێرا لەو چەقینانە ڕزگاربین. هەر وا بە دەم باسی شاباڵەکەی مرۆڤایەتی، حەزرەتی ژنەوە، ناچاریش دەبم باسی پیاویش بکەم.

ئەگەر فرۆید لە ئەزموونخانە (یۆخلەمەخانە)کەیدا سووکە گلێمێکی دەستکردی ڕۆژهەلاتیی بەسەر کورسییەکەیدا دابوو، لەو وەکۆلیانەدا کە لەمەڕ مرۆڤایەتیی نووسیوە، جەماوەرێکی نەخۆشی خەلکی ڕۆژهەلاتی کردووە بە دەسکەلای خۆی. ئەمن ڕەنگە بتوانم ئەوە بدرکێنم کە لەگەل چەند کەسانێ لە ئینسانانی نێر و مێی نەژادی جیاواز - جیاوازدا، هەروەها بە ڕێکەوت سەروساختم هەبووە و چتهایەکم لێ هەلکراندبن، دووریش نییە، ناوبەناو، بە ناوی ڕاشکاوی خۆیانەوەیان باس بکەم. دوور نییە وەک نەژاد و وەک ولات ناوی هێندێکیان بە ژێر لێوەوە بکەم. ڕەنگە کە باسی هێندێکیان دەکەم، ئەتۆ هەر بە دەموکاوێژی من، یان تەرزی ئاکار و ڕەفتاری قارەمانەکانمرا لەوانەیە ڕەنگ و ڕووی ئینسانەکان یان ولاتەکان بناسییەوە. هێندیکیان خەلکی ولاتی سەربەخۆ، برێکیان هاوولاتیی ولاتێکی چەپەکی لە گوێی گادا نووستوو، ژمارەیەکیان پارادیگماستانێ، هێندێکیان خەیالباز و یۆتۆپیایی و مالانخۆلی و فۆبیاییین، برێکیان فەمینیستی سێکسی، چەند دانەیەکیان سادی و ماسۆشێتێ، یەک دوو دانەشیان فتیشین... سیاسی زۆرێلێ و نەکارەشیان تێدا هەن. لەوانەیە ئەگەر باسی لایەنی تایبەتیی چۆن لە ئازادی نوارین، چۆن لە ئایین گەیشتن، چۆن لە حیزبایەتی گەیشتن، چۆن دەگەل ژندا ئاخاوتن، چۆن بوون بە میلیۆنێر، چۆن بوون بە ئینسانێکی خۆشبەخت (ترحێو)ت بۆ بکەم، یان بەردبارانم کەی، یان دەمخۆش بارانم کەی، بەلام حەز دەکەم هەر وا بۆ بەرکوێ لە ڕاستی ئایین و لەخۆبیانیبوون، ئەم بەشە دوایی بێنم.

لەبارەی ئایینەوە، پاش بلاوبوونەوەی کتێبەکەی Roger Garaudy بە سەرناوی «سۆسیالیزم و ئیسلامەتی» کە ڕێی لە بۆ وتووێژێکی گەرم و بەپێز لە ڕۆژنامە و کۆوارەکانی جیهاندا خۆش کرد، ڕوونکردنەوەکانی بە تایبەت بەڕێزان Niyazi Berke: و E. Tfekci و Selahettin Hilav ی کوڕی ئەرشەدی بەهەشتی، محەممەدی میهریی مفتی زادەی

خەڵکی شارە دێرینەکەی سنەی خۆشەویست کە لە ساڵی (١٩٥٦)دا لە ئەستەمبوڵ بە خزمەتی گەیشتم و هەنگێن بە کاری ئەوقاتییەوە خەریک بوو و بە خەتێکی کۆنی عوسمانییانە لە ژوور سەریەوە، بە دیوارەوە «برنجی دعوی وکیللرندن محمد میهری»ی نووسیبوو، زۆرم سوود لێ وەرگرت.

ئەمن پێم وایە هەروەک Roger Garaudy پێی وایە ڕستەی «ئایین ئەفیوونی گەلانە» کە لە تۆولۆی قسەکانی کارل مارکسدا دەخوێندرێتەوە،، لە چارچێوەی خۆی بە بێ ڕەگ و ڕیشە لە گوتن «ولا تقربوا الصلاة» ڕیشەکێش کراوە. ڕاستیت گەرەکە، ئایین لە هەلومەرجەکانی مێژووینە و کۆمەڵایەتییانەی خۆی بەدەر بە چییەتی (ماهییەت) و جەوهەرێکی ڕووت و پەتی (ئابستراکتانە) تەماشاکردن، لە مێتۆدی مارکسیستانە بەدەرە و مارکسیش و ئنگلسیش لە وەکۆلینی ڕاستیی ئاییندا نەیان گوتووە: ئایین لە هەموو شوێنێک و لە هەموو سەروبەند و زەمانێکدا، هەر هەمان کاریگەریی خۆی دەنوێنێ. مارکس لە (١٨٤٢)دا لە وەکۆڵینێکیدا نووسیویە: لە هەلومەرجەیلێکی کۆنکرێت و بە دەستی چینێکی فەرمانفەرمای دیاریکراودا، وەک پێناو و ئامێر بەکار دەهێندرێ، بەڵام وەها وانەکێکیش نییە کە وەزیفە و ئەرکی سەرشانی هەرگیز نەگۆڕێ..
هەروەها فەرموویانە: ئایدیۆلۆجیایەکی سەر بە ژێرخانی کۆمەڵە و دەگەڵ ئەم بنیاتە ماددییەدا هاوپێوەند و هاوسەروکارە (٢) و هەروەکو -Ga raudy یش لەو وتاری (ڕەخنەی هیگڵ لەمەڕ فەلسەفەی حوقووق)دا باسی ئەوە دەکا کە مارکس نووسیویە: ئایین لە هەمان کاتدا لە دژی هەلومەرجێکی بەسەر دەبرێ، سەرهەڵدان و دەگژڕاچوون و دەنگی ئیعتیراز و پرۆتێستۆیەکە:

لە ناچاری خۆ بە ئایینەوە هەڵاواسین لە سەرێکەوە، بەدەنگهاتنی ئەو ناچارییەیە کە لە ڕاستی (حەقیقەت)دا هەیە و لە سەرێکی دیکەوە لە دژی ناچارییەکی کە لە ڕاستیدا هەیە، ئیعتیراز و ناڕەزایی دەربڕینە. ئایین

دڵدانەوە و سەبووری و بووردەباریی مرۆی داڕزێندراو و ڕۆحی دنیایەکی دڵڕەق و هەلومەرجی کۆمەڵایەتیی ئەوتۆیە کە تێیدا ناحاوێتەوە. ئایین کە گۆیا «ئەفیوونی گەلان»ە. ئەوەی لەم ڕستەیەدا دەخوێندرێتەوە زێتر باسی ئاڵمان و ڕژێمی مرۆچەوسێن دەکا تا میتافیزیکانە ناساندنی جەوهەری ئایین. مارکس گرفتی ئایینی لە ئایدیۆلۆجیای ئاڵماندا بە ڕاشکاوی، لە کەلێنی بارودۆخی کۆمەڵایەتیی ئاڵمانرا باس کردووە. هەر لە هەمان کتێبدا دەڵێ: ئایین بە پێوەندیی دەگەڵ هەلومەرجی ماددی (ئابووری)دا دەگۆڕێ و گۆیا لە ئارادا نامێنێ و ئاشبەتاڵی لێ دەکرێ؟!.

"ئەم بیروبۆچوونە تیئۆریانە (بیروبۆچوونی ئایینی)ش لە نیگای خەڵکەوە، واتە پرۆلیتاریاوەش مەبەست نییە و نابێ بە بابەتی باس. ئەگەر جەماوەری خەڵک بیروبۆچوونێکی وەک بیروبۆچوونی ئایینیی هەشبووبێ، ئەمە سەبارەت بە هەلومەرج لەمێژبوو بە سەرچووبوو و لە ئارادا نەمابوو(٣). مارکس کە ئەگۆڕانی ئایین وەک جەوهەر (دیارە پێش تۆمارکرانی ئایدیۆلۆجیای ئاڵمان) پەسەند نییە. ئەمە لە تێزە (صغرا منتیقیە)کانی لەمەڕ فیۆرباخەوە تێدەگەین. فیۆرباخ لە تێزی شەشەمدا، لەسەر ئەوە کە ناچار بووە "لووزەوی مێژووینە ڕووت (ئابستراکت) کاتەوە و هەستوخوستی ئایینی بەرەو حاڵەتی چتێ ڕادا کە لە گۆڕان نایە، بەر تەشەر و توانجی ڕەخنە دەکەوێ. "سەبارەت بەمە فیۆرباخ هەستوخوستی ئایینی بە بەرهەمێکی کۆمەڵایەتی نازانێ" (تێزی ٧).

لەبەر وەی کە ئایین تاکە جەوهەرێکی وای نییە، لەبۆ هەموو چەرخ و چاخەکان لەبار بێ. لەوانەیە لە چەرخ و چاخە جۆراوجۆرەکاندا و لە چوارچێوەی هەلومەرجە جۆراوجۆرەکاندا دەوری لە یەکدی جوداواز، بگرە دژ بە یەکدی بگێڕێ (؟!) ئایین بۆ خۆی لە کەلێنی بنیاتی بنەڕەوتەی لە مێشکی مرۆدا ئایدیۆلۆجیایەکە، واتە بە شێوەیەکی شوان هەڵخەڵەتێن و ڕەمەکیفریو ڕەنگدانەوەی ئەو هەلومەرجە مادییانەیە کە مرۆڤەکانیان دەبن کاریگەرییاندا مەحکوومن.

وەلێ ئەم بەرداشت و بیروبۆچوونە کە لە ماددەیڕا چەکەرەدەکا، هەروەک شکڵ و شێوازە ئایدیۆلۆجیکییەکانی دیکە (مافەکان، سیاسەت، هونەر و دابودەستوور و بەندوباو) تەنیا ڕەنگدانەوەی نەکارە و نەستێور -pas) (sive نییە. ئەم ڕەنگدانەوەیە کەرەکتەرێکی بەرچاو و کاریگەریی دیالێکتیکییانەی هەس و بە پێوانەیەکی کۆنکرێت خێوی وەها هێزوگوردێکە کە کار لەو هەلومەرج و بارودۆخە ماددییانەی لێیان کەوتۆتەوە، دەکا. جا لەبەر هەندێ، دەبێ ئێمە ڕاستیی ئایین لە چارچێوەی ئەو هەلومەرجە کۆمەڵایەتی و چینایەتییانەدا کە هانیویانەگۆڕێ وەخوێنین. ئەمە، هەروەک تەواوی شکڵ و شێوازە ئایدیۆلۆجییەکانی دیکە، ئەوەمان لەبۆ ئاشکرا دەکا کە ئایین لە نیگای چینە فەرمانفەرما و چینە دارزاندراوەکانڕا لە حەقیقەتی ئایین دەنۆڕێن، بەدیاردەکەوێ کە ئایین بەجێهێنانی وەزیفە و ئەرکی سەرشانی لێکدی جیا ـ جیای هەیە. هەر بە دەم ئەمەشەوە، با ئەوەشتان عەرزی خزمەت بێ: کە مارکس لە نوای گشت چشتێکەوە، سەبارەت بەوە کە سیستمی سەرمایەداریی وەبەر توانج و تەشەری ڕەخنە داگە، ئایینی لە نیگای چینە فەرمانفەرمایەکانەوە خوێندۆتەوە و هەر لەبەر ئەوەیشە بە پێناو (وسیلە) ێکی مرۆچەوسێن و مرۆهەڵخەڵەتێنی لەقەڵەم داوە ؟!. بەش بە حاڵی لە فرەسەرەوە لێکدانەوەو ڕوونکردنەوەکانی ئنگلس دەربارەی ئایین، ئەوەهێی دەسنیشان کردووە کە چۆن ئەم دیاردەیە دەبێ وەک چتێکی کۆنکرێت لە نیگای مێتۆدۆلۆژیی مارکسیزمەوە، وردکرێتەوە. دە تێککگیران و دەگژیەکدی ڕاچوونێکی ئابووریدا ، ئایدیۆلۆجیای ئایین دەتوانێ کەرەکتەر (سیفەت)ێکی شۆڕشگێرانە بنوێنێ.

"لە دەرەبەگایەتی هەڵکردن و بەگژداچوونێک، ناچار دەبوا ببێ بە لە کڵێسە هەڵکردن و بەگژکڵێسەداچوون. سەرپاکی تیئۆریی (doctrines) شۆڕگێڕ و کۆمەڵەکی و سیاسییەکانیش، لە نوای گ چشتێکەوە، ناچاربوون هەر یەکە بۆ خۆیان بن بە ڕافزییەتێک، واتە: لە

ڕێی ئایین دەرچوونێ" (٤) . ئایین لە هەمان کۆمەڵدا، بەڵام لە نیگای چینی جوێ ـ جوێوە مانا و وەزیفەگەلێکی جیا ـ جیای دەگەیاند:

"لێرە، هەروەک لە فەرەنسا کوو بوو، لە ئنگلستانێ و بۆهیمیاییش زۆربەی نەجیوزادانی چکۆلە لە نێو جەنگەی کێشمەکێش و ڕافزییەتێکی کە دەسەوبەرۆکی پاپازەکان بیوونەوە، دەگەڵ ئەوانەی لە شارەکاندا بوون، یەکیان گرت. ئەو ڕووداوە، بەوە لێکدەدرێتەوە کە نەجیوزادە چکۆلەکان ناچاربوون بە نیشتەنییانی شارەکان پشت ئەستوور بن و بەرژەوەندیی خۆیان لەوەدا دیت کە لە دژی میر و بەگلەر و گەورەپیاوانی ئایینیدا دەگەڵ ئەوانەی کە لە شارەکاندا دادەنیشتن، یەک بگرن. واتە: مەسەلەکە بەرژەوەندییە و هیچی تر نییە.

"تایبەتمەندییەک کە لە ڕافزییەتدا هەبووە، ئەوە بووە کە یەکڕاست پێداویستی و خواستەکانی گوندی و ڕەشوڕووتی خەڵکی بە دەنگ دەهێناو هەمیشە کەوڵسووری بەرلەشکری یاخی بوونێ، هەرایێ بووگە، تایبەتمەندییەکی هەر بە تەواوەتی جیاوازبوو. ئەم ڕافزییەتە، خواستەکانی ڕافزییەتی بۆرجوای وە خۆ گرتبوو، بەڵام هەر وەک نوخشەی خرستیانەتی داوای ئەوەی دەکرد کە هەلومەرجەکانی چونیەکی لە نێو کۆمەڵی ئایینیدا دابمەزرێ، هەروەها داوای ئەودشی دەکرد کە ئەو چونیەکییە وەک ڕێیایەکی کۆمەڵی سیویل (مەدەنی) دەبێ بسەلمێندرێ و پەسند بکرێ(٥). کەواسا ئایین وەک ئایدیۆلۆجیای جەماوەری خەڵک لە چوارچێوەی هەلومەرجە کۆنکرێتەکاندا تایبەتمەندێتیی شۆڕشگێڕانەی دەردەست کردووەو لە سەرەتا (مبدا)ی "چونیەکیی مرۆڤەکان لای خوداوەند"ڕا بەرەو داواکاریی سەرەتای یەکسانیی مافەکان و تەنانەت ئابووری پەلهاویشتووە.

ئنگلس لە وردکردنەوەی پەرەساندنی خرستیانەتیدا دەڵێ: لە سەرەتای پەیدابوونی ئەم ئایینەدا "مرۆڤ کاتێ لە ڕزگاربوونی ماددی نائومێد بووگن، ڕزگاریی خۆیان لە نێو ئەم ڕوا نوێیەدا بەدی کردووە" و هەروەها

ئەوەشی ڕوون کردۆتەوە کە چۆن سەرلەبەری ئەو ئینسانانەی کە لە دژی "دەسەڵاتە زاڵەکان" ڕاپەڕیون لە چارچێوەی ئەم ئایینەدا یەکیان گرتووە و چۆن چۆنی لە نێوان یەکەم کۆمەڵانی خرستیان و سۆسیالیزمی هاوچەرخدا وێکچوونێ هەیە (٦).

ئایدیۆلۆجیایەکی ئایینی کە خواستی چونیەکیی لە یزداندا گوورابێ لە تەنینەوە و گۆڕانکارییەکانی دوایدا تووشی لەبەریەک هەڵوەشانەوە هاتووە و لە ئەنجامی هەرا و بگرەی چەندین چین و توێژاڵی بەرژەوەندی لێکدی جوداوازەوە بووگە وە چێشتی مجێور و بە دەیان شاخ و گوێ و ڕێباز و تۆل و نیوچە ڕێباز و بێچووە تۆل و مەزەبی لێ ڕوواوە و بە قەولی شاعیری فەیلەسووفی عەرەب، ئەبولعەلای مەعەری کە فەرمووی:

**في اللاذقية ضجة ما بين أحمد والمسيح**
**هذا بناقوس يدق وذاك بمئذنة يصيح**
**كل يصيح لدينه ياليت شعري ما الصحيح؟!**

یا وەک حافزی شیرازی فەرموویە:

**جنگ هفتاد و دو ملت همرا عذر بنه**
**چون ندیدند حقیقت ره افسانه زدند**

یا وەک پێغەمبەری ئیسلام سەلامی خودای لەسەر بێ فەرموویە:

«ستفترق أمتي إلي اثنتين وقبل سبع واثنتين فرقة كلهم في النار إلا الفرقة الناجية» داری وەسەر بەردەوە ئەماکە و دە جەنگەی ململانێ و شیروتیر لێکدی سوینی کاتۆلیک و ئۆرتەدۆکس و پرۆتستانت و مۆرمۆن و نەستووری و سەبتی و تاددا بەش بە حاڵی خرستیانەتی و هەروا بۆ نموونە: موعتەزیلە و ئەشاعیرە و ماتوریدییە و مورجیئە و کەیسانییە و دەیان تۆل و مەزەبی ئەهلی کەلام (فەلسەفەی لاهووت) و حەنەفییە و شافیعییە و

مالیکییه و حەنبەلییه و دوازده ئیمامی و زەیدییه و ئیسماعیلییه و فاتیمییه و ئەهلی هەق و تاد....ی ئەهلی شەرع و سیاسەت و ئیمامەت و تاد...دا، کێشەی چینایەتی زۆر ئاشکرا و بە ڕاشکاوی بە دەمی خۆی هاوار دەکا.

"ئاینێ لە پاش چاوپشکووتنێ، دەبینین هەمیشە نێوەرۆکێکی باوی دە هەگبەدا بووگە. ئەمە هەر لە ئاینێ ئەقەومیاگە برا، ئەدی ئابینی باو (تقلید، رسم) دە تەواوی بوارە ئایدیۆلۆجیکییەکانی دیکەشدا وەک هێزێکی وەپارێز (موحافەزەکار) قوت دەبێتەوە؟ وەلێ جوداوازیگەلێ کە دە نێو ئەم نێوەرۆکەدا قوت دەبنەوە، لە پێوەندییە چینایەتییەکانەوە ئاودەخۆنەوە. واتە: لەو پێوەندییە ئابوورییانەی کە ئەم جۆرە جوداوازی و گۆڕانکارییانەیان لە نێوان ئێنسانەکاندا هێناوەتە گۆڕێ، ئاودەخواتەوە"

کەواسا، ئاینێ وێڕای وەی لێل پێوەندییە ئابوورییەکانا هاوسەروکارەنێ، دە هەر کۆمەڵێ، دە هەر هەلومەرجێکدا و لە ئیگای هەر چینێکەوە، هەر هەمان مانا ئابەخشێ، هەر هەمان کاریگەری ئانوێنێ و ڕێگا بۆ وەدی هاتنی ئاکامگەلێکی بەکردەوەی جودا ـ جودا و تەنانەت دووفاق و لێکدی تاق و جووت خۆش و هەموار دەکا. ئاینێ هەروەک، خودانەخواستە، دەتوانێ ببێ بە ئامێری مرۆهەڵخەڵەتێن، هەر بە هەمان ئەندازە دەشتوانێ ببێ بە فاکتەرێکی مەعنەوی بۆ مرۆ بەرەو بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕانە هان دا و وەجۆشی بێرێ.

لەو قسانەی سەرەوە، ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە لە بزووتنەوە میللییەکاندا ئاینێ هەموو جارێ و لە هەموو کاتێکدا هەر هەمان دەور ناگێڕێ. لە وڵاتەیلێ کە لە دژ چەوسیانەوە و ئیمپریالیزم خەبات دەکەن، لە چارچێوەی برێ هەلومەرجی دیار و ئاشکرادا، ئاینێ بۆی هەیە تەنانەت بتوانێ دەورێکی "هاودەسەبەرێ" دەسەبەرساز بگێڕێ. بە نموونە هەر وەک ئێنگلس دەڵێ، خرستیانەتی لە سەرەتاوە لە خەباتی دژ بە چەوساندنەوەدا دەوری خۆی گێڕاوە. هەروەها تەواوی یاخیبوونەکانی سەروبەندی ئیسلام

له سەرەتاوە لە کێشە و هەرای ئابووریی نێوان دەشتەکی و شارییەکانەوە ئاو دەخۆنەوە و ئەم یاخی بوونانە لە پێشـان خـۆیان دە بەرگی ئایینی پێچاوە و هەمیشە دووبارە و چلبارە بوونەتەوە و هەر بۆ هەمان سەنگەر کە لێوەیڕا تێ هەڵچووگن، سەرلەنوێ، جووووووورڕڕڕڕ، گەڕاونەتەوە..
پیاو ئەگەر بیر لە قسەکانی ئنگلس کە دەڵێ: "ئیسلامییەت هەر دەڵێی بە بەژنی ڕۆژهەڵاتییان بڕاوە"، "ئەم هەموو سەرهەڵدان و یاخیبوونانە بێ وەی هەلومەرجەکانی ئابووری بگۆڕن، ناشبەتاڵیان کردووە" دەکاتەوە وا پێدەچێ ئنگلس، بنیاتی ئەشلەقاو و وستاوی بێ ڕەنگ و بێ تام و بێ بێنی کۆمەڵگایەکانی ڕۆژهەڵات و ناڕاستەوخۆیانە، تەرزی ڕەنێوهێنانی ئاسیاییی ڕەچاوکردووە. ئنگلس بە دەم قسە لەسەر بزووتنەوە خۆبەبەرگی ئایینەوە پێچاوەکانی دژ بە چەوساندنەوەکانەوە، هەڵوێستی محەممەد ئەحمەدی سوودانیی بە نموونە هێناوەتەوە کە چۆن سەرکردایەتیی گوندی و ڕەوەندانی لە دژ ئینگلیسە ئیمپریالیستەکان کردووە و دەبەرابەر ئیمپریالیستاندا سەرکەوتووە.
ڕاستییت گەرەکە ئەگەر بمانەوێ بزانین دەوری دیاردەی ئایین لە باروودۆخێکی مێژووییەی کۆنکرێتدا وەک فەلسەفەی مارکسیزم بە شێوەیەکی زانستانەی ئۆرپوەتێ ـ بزانین چبووە و چییە، نابێ ئایین بە ناوی پێشکەتخوازییەوە وەک "سەفسەتە" یانیش تەنیا وەک "وشکەسۆفیتێ"ی (تعصب) تێ بگەین. ئەگەر ئایین وەک ڕاستییەکی کۆمەڵایەتی دە نەزەر نەگرین و تەنێ هەر بە ڕووتی (تجریدی = ئابستراکتانە)ی ڕەتکەینەوە، ناتوانین کار لە ئایدیۆلۆجیایەکی، کە ڕەگوڕیشەکانی لە دنیای ماددی ڕۆچووە، بکەین.
هەروەک E. Tfeki زۆر جوانی بەیان فەرمووە، "بمانەوێ و نەمانەوێ، کۆمەڵگایە ئایینییەکان دە قۆناخی پەرەساندن و گەشەکردنی دیاریکراویاندا، ڕاستییەکن. ئێمە، سۆسیالیستەکان هەروەک دە بواری ئابووری و کۆمەڵایەتیدا بۆ کۆمەڵێکی دیاریکراو دەیکەین دەتوانین دە

بواری ئایدیۆلۆجیشدا ئەو هەنگاوە بەرەوپێشەوانەی کە گەشەکردنی کۆمەڵ هەموار دەکەن بەو کۆمەڵە هەڵبگرین" (Yn, ژ: ١٤٧). لە ئایین بە چتێکی "پڕوپووچ" نۆڕینت، واتە: بەچتێکی دە بنەڕەتدا بۆ ڕەگوڕیشەماددی و "بیروبڕوایەکی هەڵە" و "هەر لەبەر بە ڕووتی جاڕدانی هەڵبوونی نەمان و لەناوچوونی" زانینە. ئەم تەورە، هەر وەک ئاغای E. Tfeki ڕوونی کردۆسەوە بیروبۆچوونێکی لیبرالیستانەی (ئەمە دە بناخەی ڕادیکالیزمیشدا بەرچاو دەکەوێ) میکانیستی پێش هیگڵە و کەرەکتەرێکی دژ بە دیالێکتیکی هەس. کارێ کە ئەوێ بکرێ، ئەوەسا کە بتوانرێ دەوری ئایین لەو ڕووەوە کە ئایدیۆلۆجیایەکە، دەسنیشان بکرێ و بچەسپێندرێ و لایەن و بەندوباوە دووفاق و یەک لە شام و یەک لەحەڵەبەکانی یەکلاکرێنەوە و شەن و کەو بکرێن و بە پێی ئەو ڕاستیانەی کە ئاوها لە زانستە ساغڵەمەکانرا هەڵێنجراون، واتە: دە بواری کارەکردەنییەکاندا، وەسەر ڕێگا کاریگەر و دروستەکان کەوتنە.

بەش بە حاڵی وتوویژ و لێوەکۆڵین و بیروبۆچوونی نەزەرییانەی زۆروزەوەندی ئەم ساڵانەی دواییی لە هەردوو سەنگەری ئایینی و لاییکی (عیلمانی)ڕا لە کوردستانی نیوچە ئازاددا، دە بنەڕەتدا پێوەندییان بە قووڵی لێل سەرکەوتن و سەرنەکەوتنی چالاکییە کردەنی و شۆڕشگێڕەکاندا هەس. ئێمە بێژین و نەیەژین، تا ئەندازەیەکی بەردڵگر پاشماوەی ڕژێمی ئابووری ـ کۆمەڵەکیی ئیمپراتۆریی عوسمانی و هەروەک هەرچییەکمان وەک پاشماوە لە سوننیتی و شافیعیتی و عەلەویتی و یەزیدیەتی و کاکەیەتی و دوازدە ئیمامی و بەهائیەتی و هەقەیەتی و تاد... بۆ ماگەسەوە تا ئێستا لە ڕووی بنیاتی کۆمەڵایەتی ـ ئابوورییەوە لە مانای نەگەیشتووین و هەر وەو ئەندازەیەش، لە مەڕ ئەو هەڵوێستە دووفاق و تاقوجووتانەی کە لە چەندین تێڕوانینی جودا ـ جودا و جۆراوجۆر کەوتوونەوە، بابیی پێویستیان فر سەر لێ دەرناکەین... ئێستا لە کوردستان هەلومەرجێکی وا هاتۆتەگۆڕێ تا ڕادەیەک هەموو حیزبێکی

ئیسلامی چ بێ منەت چ بە منەت بە قسە و نووسین و ڕادیۆ و تەلەفیزیۆن و چالاکی نواندن، ـ مالم قەبرە ـ هەمموو هەر دەڵێن دەبێ کار بۆ کوردایەتی بکەین.. بەڵام بە بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن یان نایانگەرەگە دگانی پێدا بنێن، کوردایەتییەکەش هەر وەک ئیسلامەتییەکە بووگە وە بالاگەردانی بەرژەوەندیی کۆمەڵەکی ـ ئابووریی چینایەتی، بەرژەوەندیی ئەم بەرەیەو ئەو بەرەیەیە..

کورد لەم سەروبەندەدا دەیەوێ خێوی ئابووریی کوردستان بێ و لە کۆنترۆڵکردنی دەسەڵاتی بیانیی ڕزگار بێ، بەڵام دەبێ ئۆرگانیزاسیۆنەکانی کورد لە چوارچێوەی بەرژەوەندیی گشتدا لەم قۆناخەیدا هەر هیچ نەبێ بیر لەوە بکەنەوە گەلۆ لە پای چی نزیکەی لە ٧٠%ی لاوانی کورد زێتر ڕوودەکەنە مزگەوتەکان نەک ئەو ئۆرگانیزاسیۆنانە؟ لەبەر چی لاوان بەرەو هەندەران سواری گای هار دەبن و خۆ بە دەم دەیان مەترسی و دووبەختییەوە دەدەن؟ ئەمە لە ئاکامی لە خۆو لە هەمموو چتێکی ئەم وڵاتە بیانیبوون نییە؟!

دەی جا، با چتێکیش لەمەڕ مانا و چەمکی لەخۆبەبیانیبوونی مرۆ بێژین.. لەخۆبەبیانیبوون، بە درێژاودرێژیی مێژوو لە ماکی فەلسەفە و تیۆلۆجیی جۆراوجۆردا دەورێکی گرینگی گێڕاوە. دە سیستمە میتافیزییەکاندا، قسە لەسەر ئەوە دەکرێ کە "حەقیقەت"، "موتڵەق"، واتە: خوداوەند لە بوونی خودی خۆی دوورکەوتۆتەوە و بە شێوەیەکی بەخۆ بیانی و ناجۆر هاتۆتەگۆڕێ.. واژەگەلی وەک "بەچۆکداهاتن"، "کڕنووش بردن" و "لەسەر زگی ڕووت بەسەر زەویندا بەرەو پیریی شێخ و پیرانی تەریقەتەوە چوون" و تاد... واژەگەلێکن کە بۆ مانای لەخۆبەبیانیبوون وەزوان هاوردن، وەکار بریاگن. هەروسا، هەمان مانا و چەمکمان، لە تەسەووفی ئیسلام و تەسەووفدا، بە دۆنێکی ئایینی و میستیکییەوە تووش دەبێ. چەمکی لەخۆبەبیانیبوون، بە دەم ڕۆژگارەوە لە مانائایینییەکەی و میستیکییەکەی دارندراوە و بە تایبەتی لە فەلسەفەی

هیگلدا مانایەکی ئەقلی (rational)ی لێبارکریاگە. وەک دەزانین، هیگل لەو بڕوایەدایە کە کۆسمۆ (گەردوون) لە ئاکامی لەخۆبەبیانیبوون و پاشانەکێ بۆخۆگەڕانەوەی سەرەتایەکی مەعنەوی و سەرووخۆڕسک کە هیگل بە idea (نموونە = میسال)ی نێوناوە، هاتۆتەگۆڕێ. ئەوجا لە پاشان، Feuerbach بە پەیڕەوی لە هیگل، مانای لەخۆبەبیانیبوونی لە نیگای ئایینەوە، وا لێکداوەتەوە کە مرۆڤ ئایین و ژیانی ئایینی و هێزوگوڕدەکانی خۆی وەک چتهایەکی لەخۆبیانی و نامۆ دەبینێ. بەڵێ وەلای ئەومەوە لەخۆبەبیانیبوون، نە لەمەڕا هاتۆتەگۆڕێ. واتە: وەلای Feuerbach ەوە ئادەمزاد بەوەی کە لێوەشاوەیی و هێزەکانی خۆی بە لێوەشاوەیی و هێزی غەیری خۆی دیتووە، خودا و ئایینی (بە مەزەنەی خۆی و لە مێشکی خۆیدا) گووراندووە. هەرچی Moses Hess M.ی باڵی چەپی فەلسەفەی هیگلە، لەخۆبەبیانیبوون، واتە مرۆ ئەو چتانەی کە خۆی دەیانخوڵقێنی و وەبەرهەمیان دێنێ، وەک چتهایەکی بیانییان کە ئی خۆی نەبن و ملکی یەکێکی دیکە بن دیتێ، بە ڕاستییە ئابوورییەکانەوە گرێداوە. بە پێی تێڕوانینی Hess M. ملکەچکردنی مرۆڤ بۆ خودا، لە بەدەنگهاتنی ملکەچکردنی مرۆڤ بۆ کالا و پوول لە مەیدانی ئایدیۆلۆجیدا بەولاوە چیدیکە نییە (تکایە بیر لە فەرمایشتی ئیبنولعەرەبی کە گوتوویە "دینکم دنانیرکم تحت قدمی هاتێن" بفەرموون ـ ش. م).

کەواتە: چەمکی لەخۆبەبیانیبوون تێکرا بەم جۆرە دەناسێندرێ:

"لەخۆبەبیانیبوون، بە مانای لەباو و تەقلیدی واتە: هەر بوونەوەرێ ئەوەی تێیدایە لە خۆبەدەری کا. بەلام بەلای تیۆلۆگ (لاهووتییەکان)ەوە خوداوەند، بەلەخۆبەبیانیبوون (لەخۆبەدەرکردن ـ H .S.) دنیای خولقاندووە" (٦).

لەسەرێ ڕوونمان کردەوە کە لەخۆبەبیانیبوون لە لایەن Feuerbachو M. Hess ەوە لە چەمکی خوداگەری (تیۆلۆجیک) قوتارکراوە. هەرچی K. Marx ە چەمکەکەیان پتر بەرچاو (مشخص)تر کردووە و لە شێوەی

گریمانە (فرضیە)یەکی ژیانی مرۆڤیدای بەکارهێناوە.

بـــــە لای Marx ەوە لەخۆبەبیانیبوون ئەوەیە کە چێـکی مرۆڤ بەبەرهەمی دێنێ لە دەستی هەڵێ و قوتاری بێ و بچێتە حاڵەتێکەوە کە دەبەرابەر ئەو مرۆڤەدا وەک بیانی و دژمنی لێ بێ. جا ئەمە، هەر وەک لە ژیانی ئابووریدا دەیبینین، لە ژیانی سیاسیشدا، لە بواری مێژووشدا و لەفام و دەرک (ئەندێشە و هەستوخوستێ)ی مرۆڤەکانیشدا، دێتەگۆڕێ. بە ڕاســــتی Marx مەبەستی لە مانای لەخۆبەبیانیبوون پتر لەخۆبەبیانیبوونێکە کە حاڵەتێکی تایەتیی لەخۆبەبیانیبوونی ئابوورییە. بە لای ئەوەوە ئەم دیاردەیە تەنها هەر مڵکییەتی تایەتی نایخوڵقێنێ، بەڵکو کاردابەشکردن ئەوەندەی دیکەی خەست دەکاتەوە. ئەمە لە بەشی چارەمی بەرگی یەکەمی کتێبی سەرمایەدا، بە نێوی "فیتیشیزمی کاڵا و نهێنیی وێ)یەوە ڕوون کراوەتەوە. ئەو مرۆیەی کە بە کاری کردەنیی خۆی بەرهەمانی ڕەنێو دەهێنا، هەم لەدەستدەرچوونی بەرهەمەکانی بە چاوە خۆ دەدیت و هەم بە حاڵەتێ دەگەیشت کە نیدی ئەو کروکۆششتەی بەرهەمی پێ وەبەرهەم دەهێنا، جارێکی دیکەی بۆ قەرەبوو نەدەکرایەوە و لەگەڵ ڕەنج و کروکۆششتەکەی خۆیدا دەبوو بە بێگانە و نامۆ. واتە ئەوەی کە لە خۆیدا هەبوو، لەخۆبەدەری دەکرد و جارێکی دیکەی وەکە خۆ بۆ نەدەگەڕایەوە. بە نموونە کرێکارێ بۆ ئەوەی بتوانێ ٨ سەعات کار بکا، پێویستیی بەوەندە توانست (وزە) هەیە کە ئەو ٨ سەعات کارەی پێ دەسەبەر بکا، هەیە. گریمان ئەو کرێکارە بە پێوانەی ستاندارت بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو وزەیە، ڕۆژانە پێویستیی بە ١٠٠ دینار هەیە، باشە ئەدی ئەگەر هات ڕۆژانەکەی لە ٣٠ دینار زێتر نەبوو، کوو ئەو وزەیە بۆ ڕۆژی پاشێ قەرەبوو بکاتەوە؟! ئەم حاڵەتە وای لە مرۆڤ دەکرد کە دەبوو لە ناچاری و بە زۆرەملێ کار بکا و لە قەپێلکی ئینسانەتیی خۆی دەرچێ و خۆلاسە ببێ بە پارچەیەکی بێ گیانی مەکینە، (فیلمەکەی چارلی چاپلن وەبیرە خۆ بێنەوە).. بە لای Marx ەوە، لەخۆبەبیانیبوونی ئابووری، دە

کۆمەڵی سەرمایەداریدا بەوپەڕی چڵەپۆپەی گەیشتووە و مرۆی کردووە بە "وانێک"، بە "پێناو"ێک و لە ئینسانەتیی خودی خۆی بێ بەهرە کردووە. ئینسانەکان، ئەو وانێکانەی کە بە ڕەنجی شانی خۆیانیان وەبەرهەم دەهێنا، وەکە چتهایەکی لەخۆبەدەر و سەربەخۆ و هەروەک فریان بەوانەوە نەبێ دەدیت و پێیان وابوو لە نێوان ئەو بەرهەمانەدا کە پێوەندییەکانی نێوان خۆیان وەبەرهەمیان دەهێنا، پێوەندییەکی سەربەخۆ هەیە. Henri Lefebvre، تیۆریی لەخۆبەبیانیبوونی ئابووری، واتە: (فیتیشیزم) بەم جۆرە ڕوون دەکاتەوە:

"فیتیشیزمی سەرەتایی و جادوو، زاڵبوونی خۆڕسکی بەسەر ئادەمزادداو هێز و گوردی خەیاڵبافانەی ئادەمزادی بەسەر خۆڕسکدا بە دەنگ دەهێنا. هەرچی فیتیشیزمی ئابوورییە (واتە: وانێکێکی کە مارکس فیتیشیزمی ئابووریی پێگوتووە) زاڵبوونی ئەو بەرهەمانەی کە مرۆ بۆ خۆی ڕەنێوی دەهێنان، بەسەر هەر هەمان ئەو مرۆیانەدا، هەروەها ئەو هێزوگورد (فەرمانفەرما) خەیاڵییانەی کە بەسەر ئۆرگانیزاسیۆنی خودی ئەم مرۆیانەدا و بەرهەمەکانیاندا زاڵ بووە، بە دەنگ دێنێ". مارکس ئەوەی ڕوون کردۆسەوە، کە مرۆ لەو بەرهەمانەی خۆی ڕەنێوی هێناون، هەر یەکەی بووگە وە فیتیشێک و "وانێک"ێک و لێیان دابڕاوە و ئەم دابڕانە بەرە ـ بەرە هێندەی دیکە جیرتر و خەستوخۆڵتر و سەختتر بووگەسەوە. ئەم "بەوانێکبوون" (Al، Verdinglichung) .Fr. Rificatios، کە بە قۆناخەکانی کالا ـ پووڵ ـ سەرمایەدا تێدەپەڕێ، بەرە ـ بەرە هێندەی دیکە جیرتر و خەستتر و سەختتر دەبێتەوە. لە بارێکدا کە پووڵ وانێکێکە مرۆ بۆ خۆی دایهێناوە، جێی پێوەندییەکان و ژیان (هەستوخوست و ئەندێشەکان)ی مرۆڤەکانی گرتۆتەوە. "بە جوانی و زیرەکی دیتنی مرۆی پووڵدار" و "کاتێ دەبن بە دزێو و ناشیرن و بوودەڵە" هەر سەبارەت بەمە سەری هەڵداوە. کاتێ کە کەسانێ جێگەیەلێکی لە ڕووی گرینگیی کۆمەڵاتییەوە داگیردەکەن و لە قوماشە ئەسڵییەکەی خۆیان بە ئابوتابتر و

به جـــۆرێکی دیکه دەبینرێن؛ هەروەها هونەرمـــەندان و توانست و لێوەشاوەیی و داهێنانەکانیـان به چـێـکی زۆر له مرۆڤایەتی جوداواز و هەڵاوێردە و تاد..." به دەنگ دێن، نموونەگەلی "بەوانێکبوون"ن. هەروەها توانست و لێوەشاوەیی و هێزوگوردی بێ سەرحەد و سنوور (بۆمبای ناتۆم)ی مرۆڤەکان، که دەبنه بەڵای سەریان، ئەمەیشـه هەمدیس نموونەی زەقوزۆپی لەخۆبەبیانیبوونە.

کەواتا، مارکس چەمکی لەخۆبەبیانیـبوونی به جۆرێکی گرنگانەی وا بیر لێ کـردۆتەوه کـه له دواڕۆژدا له بواری جـۆراوجـۆردا بۆ لێـوەکـۆڵینه زانستـیـیەکـان ببێ به چـێـکی به کەڵک و به تایبەتی به پێی لەسەر لەخۆبەبیانیبونی ئابووری داگرتن وەک بنەما، کـتێـبەکەی نووسـیوه. هەر لەبەر هەندێ، لەخۆبەبیانیبوون، له لێکدانەوه ڕەسمیـیەکانی بیروئەندێشه بەدەرەکـانی مـارکـسـدا لەم سـاڵانەی دواییـدا لەگـەڵ سـەرلەنوێ وەک چەمکێکی لەنوێژەنەوه هاتنەکـایەوەی، ده ئەسـڵـدا، له نێـوان سـەرەتا بنەڕەتیـیـەکـانی مـارکـسـیـسـزمـدا، جـێی خـۆی گـرتۆتەوه. گـەوره مارکسیستەکانی وەکوو (Geoge Lukacs, Auguste Cornu ,Heneri Lefebvre ) تاد... لەم چەمکه هەمیشـه سوودیان وەدەست هێناوه. ئەخـوازەڵڵا بەرلەوەی Lukacs نووسـینەکـانی سـەروبەندی لاوێتیی مارکس متاڵا بکا، شاکارێکی که له بەرگی چارەمی سەرمایەی مـارکـســەوەی تێ هەڵچـووه، نووسـیـوه و وا زانراوه کـه چەمکی "بەوانێکبوون"ی ده پلانی یەکەمدا ڕەچاوکردووه. ئنگلس، هەر هەمان چەمـکـی هـەرچـەنـدی بـه پـارێـزەوه دەسـت بـۆ بـردووه، پـەیـدەرپـەی بەسەرکردۆتەوه. کەواتا، چەمکی لەخۆبەبیانیبوون له نیگای ڕەگوڕیشەوه، وێرای وەی کـه چەمکێکی تیـۆلۆجی و میـتـافـیـزیکیـیـه، له پاشـان له جـەرومـەنگەنەی گـۆڕانکاریـیـەکی چلۆنیـەتی دراوه و لەسـەر دەسـتی کـەڵەزانایانی بیـر و ئەندێشـەی سـۆسـیـالیـزم، وەک چەمکێکی بنەڕەت ڕەچاوکراوه.

سەرچاوەکانی بەشی شەشەم و حەوتەم:

١. خلاصە، دورە، دوازدە جلدی بررسی تاریخ تمدن/ تألیف آرنولد توین بی/ ترجمە، محمد حسن آریا!
2- SALAHATTIN HILAV. FELSEFE YAZILARI
3- Theodore Zeldin, Insalarin Mahrem Tarihi
4- Orlando Peterson, Freadem in The Making in Westren Culture

٥- فرهنگ اندیشە، نو/ لولیورا ستلی بولک/ ویراستار ع. پاشائی.
٦- فرهنگ علمی وانتقادی فلسفە/ اندرە لالاند/ مترجم دکتر غلا مرضا وثیق.
٧- مارکس وسیاست مدرن/ بابک احمدی
٨- کارل مارکس/ سرمایە/ ترجمە، ایرج اسکندری.
٩- اشخاص در آثار شریعتی/ پژوهش و تدوین قاسم میر آخوری - حیدر شجاعی.
١٠- اندیشهای مارکسیستی/ حسن بشیریە.
١١- تاریخ اجتماع هنر/ ا. هاورز/ ترجمە، ابراهیم یونسی.
12- Lenin- Din uzerine

## ژیان و بەرهەمەکانی مامۆستا شکور مستەفا
## (بەدەستخەتی خۆی)

(١) لە ساڵی (١٩٢٦) لە گوندی «مامشە/ مەحمەشاە» لە ناوچەی قەرە حەسەن لە دایک بووە، باوکی خەڵکی سلێمانی و دایکی خەڵکی (کۆسە و بامردە)یە.

(٢) لە تەمەنی (٩) مانگاندا بابی باروبنەی بۆ بارەگای بینایی چاوان پێچاوەتەوە و شکور بە هەتیوی دەگەڵ دایکێکی هەژاریدا ماوەتەوە.

(٣) لە (١٩٣٢)دا هاتۆتە کەرکووک، لەوێندەر دەبەر خوێندن نراوە و قورئانی پیرۆزی دەخزمەت مەلا ئایشە خاندا خەتم کردووە.

(٤) لە خزمەت مەلا محەمەدی تورکماندا، فێرە تورکی و فارسی و عەرەبی بووە.

(٥) لە (١٩٤١)دا بۆتە فەقێ و لە خزمەت مامۆستا مەلا سەعدوڵڵای کوڕی مەلا محەمەدئەمینی هەوایی زادەی خەڵکی دوشیوان تا جامی خوێندووە.. پاشان لە خزمەت مامۆستا مەلا سەید ئەحمەدی جەباری و مەلا عەبدوڵڵا بلاوە و مەلا عەلی لەیلاندا تا نیوەی سیووتیی خوێندووە.

(٦) لە (١٩٤٧)دا چۆتە بەغداو لە مەدرەسەی (الهداية الاسلامية)ی خوێندووە.

(٧) لە (١٩٤٩)دا لە کوللییەی شەریعە قبووڵ کراوە و تا (١٩٥٥) لەوێی خوێندووە.

(٨) لە پەنجاو پێنجدا دەگەڵ مام جەلال سەفەری وارشۆیان کردووە و

هاواریان بۆ کورد کردووە، سەفەرەکەشی بەبۆنەی فەستیڤاڵی پێنجەمی لاوانی دنیاوە بووە.

(٩) لە (١٩٥٥/١١/١٢)دا بۆتە مامۆستای زمانی عەرەبی لە سانەوی (بەعقووبە) و دوو ساڵی تیدا ماوەتەوە.

(١٠) لە (١٩٥٧/٩/٢)دا دوورخراوەتەوە بۆ عانە و ڕاوە. لەوێ (٩) مانگ مامۆستایی زمانی عەرەبی کردووە.

(١١) لە مانگی (٣)ی (١٩٥٧)، دوورخراوەتەوە بۆ حەبانیە.

(١٢) لە ئاخر و ئۆخری (١٩٥٨)دا گوێزراوەتەوە بۆ کەرکووک، پێش هەرای کەرکووک خۆی ڕاگوێزتۆتە سلێمانی و لە سانەوی سلێمانی تا (١٩٦٠) ماوەتەوە.

(١٣) هەر لەو ساڵەدا ڕایانپێچاوەتە قەڵادزێ و لە (٣) ڕۆژی پتر تێدا نەماوە.

(١٤) هەر لەو ساڵەدا ڕایانگوێزتۆتەوە بۆ کەربەلاو لەوێ شەش ساڵی خشت ماوەتەوە.

(١٥) لە (١٩٦٦)دا ڕاگوێزرایتە بەغدا و تا ساڵی (١٩٧٠) لە سانەویەی جومهووریە مامۆستای زمانی عەرەبی بووە.

(١٦) لە (١٩٧٠-١٩٧١) گوێزراوەتەوە بۆ مدیریەتی دیراسەی کوردی، لە خزمەت جەنابی کاک (سامی عەبدولڕەحمان)دا خوێندنی کوردیان تا دوا پلەی ناوەندی جێبەجێ کردووە و سەرلەبەری کتێبە دەرزییەکانی فێرگەکانیان دەگەڵ مامۆستا و ڕۆشنبیرانی پەروەردە و خوێندندا کردوون بە کوردی.

(١٧) لە (١٩٧٥)دا گوێزراوەتەوە بۆ کۆڕی زانیاری کورد، لە بەغدا.

(١٨) لە (١٩٧٧)دا کراوە بە (امین عام)ی کۆڕی زانیاری کورد و دەخزمەت مامۆستا مەسعوود محەمەدی جەلی زادەدا تا (١٩٧٩) کاری کردووە.

(١٩) پاشان کۆڕی زانیاری کورد هەڵوەشێندراتەوە و (شکور

